تاریق ئۆسلو

# درەختەکان

چەند ڕاستیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر دەربارەی
درەختەکان کە تا ئێستا لە کتێبەکانی زانست و
زیندەوەرزانیدا باس نەکراوە.








# درەختەکان



چەند ڕاستییەکی سەرسوڕهێنەر دەربارەی ژیانی درەختەکان

کەلە کتێبەکانی زانستدا نەنووسراون.



# درەختەکان


نووسینی: تارق ئۆسلۆ

وەرگێڕانی: لەنیا مەحمود ئەحمەد

پێداچوونەوە و داڕشتنەوەی: ئەڤین صدیق محەمەد



لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارە سپاردنی (١٢٩٥)ی ساڵی (٢٠٢١)ی پێ دراوە.





**ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا**

**ARA MEDIA CENTER**

+964 (0) 770 938 3000 | +964 (0) 750 938 3000

www.aramediacenter.com    info@aramediacenter.com

بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوی بەرهەمەکان: سلێمانی، شەقامی سەرەکی تیسکان، نزیك کەمپی ناوشاری زانکۆی سلێمانی




# پێشەکی



خـــوێنەرە بەڕێـــز و تامەزرۆکـــانی "زنجیـــرەی بەدیهێـــنراوە سەرسوڕهێنەرەکان"، جارێکی تر سڵاوتان لێ بێت!

لە پێشانگەی کتێب، چەندەها خاتوون و پیاوی بەڕێز دێنە لام و پـێم دەڵـێن: " ئـێمە بە پەرتووکەکـانی ئێـوە گەورە بـووین"، سەرەتا سەرم دەسوڕمێت و دواتـر لە نـاخی خۆمـدا دەمەوێـت بڵـــێم: "ئێـــوە چ زوو وا گەورە بـــوون؟" بەڵام ئەمە جێـــی سەرســـوڕمان نیـــیە. کاتێـــک بیـــر دەکەمەوە کە پەرتـــووکی "بەدیهێنراوە سەرسوڕهێنەرەکان" و دە ساڵ بەدوایـدا پەرتـووکی "ئـاژەڵە سەرســوڕهێنەرەکان" نــووسراوە، چــونکە ئەوانەی کە یەکەم پەرتووکیان خوێندووەتەوە نۆ ساڵ بوون و ئێستا بـوونەتە نۆزدە ساڵ!

بەڵـێ، خـوێنەرە کۆنەکـانم گەورە بـوون و ئێسـتا لە تەمەنـی گەنجیـدان. لە نێوانیانـدا چەنـدەها هەیە کە بە خۆشـحاڵییەوە پەرتووکە نوێیەکانم دەکڕن و دەیخوێننەوە.

ڕێژەی ئەو خوێنەرانەش کەم نین کە دەڵێن: " من بۆ خوشک و براکەمی دەکڕم."

خۆشەویستانم شەرم لە چی دەکەن! ئەمانە ئیتر باوکەکان، باپیرەکان و داپیرەکان دەیخوێننەوە!

ئەگەر بێتوو چەند ساڵێکی تر بەردەوام بم لە نووسینی زنجیرەی "بەدیهێنراوە سەرسوڕهێنەرەکان"، ئەوا دوای دە ساڵ کەسانێک دەبینم کە پێم دەڵێن: "ئێمە کە منداڵ بووین پەرتووکەکانی تۆمان دەخوێندەوە، ئێستاش منداڵەکانمان پەرتووکەکانت دەخوێننەوە!"

من وەکو نووسەرێک، یەکێک لە خۆشترین ڕۆژەکانم ئەو ڕۆژە دەبێت کە ئەوە دەبینم.

ڕۆژگار تێدەپەڕێت و پەرتووکی "بەدیهێنراوە سەرسوڕهێنەرەکان" تەشەنە دەکات. وای لێ دێت ئەو نەمامی هەنجیرانەی لەگەڵ دەرچوونی یەکەم کتێبدا تازە خەریکی بەرهەمهێنانی کاربۆهیدرات بوون، لە کرداری ڕۆشنەپێکهاتن لەلایەن سەوزەپلاستیدەکانەوە بوونەتە درەختێکی گەورەی هەنجیر، یاخود درەختێکی پرتەقاڵ... بەدڵنیاییەوە درەختی سێویش دەبێت، یان درەختی لیمۆ کە هەر بە بۆنەکەی دەمت ئاو دەکات... یان هەنار، یاخود بەهێ...

تۆ سەیری! لەو کاتەوە بیـر دەکەمەوە چـۆن بـابەتەکە بهێـنمە سەر باسـی درەختەکـان. دیـارە ئەگەر بیـدەمە دەسـت ڕەوتـی خۆی، ئەوا بابەتەکە دەگاتە سەر ڕەگی درەختەکانیش.

خانمە بەڕێزەکان و پیاوە بەڕێزەکان!

ئەم پەرتووکەی بەردەستتان، پەرتـووکێکی دیـکەی زنجیـرەی "بەدیهێـنراوە سەرسـوڕهێنەرەکان"ە، کە بـابەتی درەختەکـانە! ڕاستتر بڵێم "درەختە سەرسوڕهێنەرەکان"

فەرمـوون، بـا لەژێـر سـێبەری ئەو درەختـانەدا دابنیشـین و گفتوگۆ بکەین. لە ژێر کام درەختانە بێت؟ جیاوازییان هەیە؟

هەر درەختی ژەهراویی مانشینیڵ نەبێت، ئیتر چی درەختێـک دەبێت با ببێت.

بـا درەختـی زەیتـوون یـان سـنەوبەر بێـت، یـاخود درەختـی شۆڕەبی، کاتێک لقەکانی بەسەرماندا شۆڕ دەبێـتەوە و گەرمـی تیشکی خـۆر کەم کەم لـێمان دەدات؛ لقەکـانی سـێبەرمان بـۆ دروسـت دەکـات... ئەوە بەسـە کە تەنهـا درەختێکتـان چاندبێت....

تارق ئۆسلۆ

" ئێمە باراناومان لە ئاسمانەوە ڕشتووە بە ڕشتن. پاشان
زەویمان لەت کردووە بە لەتکردن. جا دانەوێڵەمان تیا ڕواندووە.
ترێ و شینایيشمان تیا ڕواندووە. دار زەیتوون و دار خورمایشمان
تیا ڕواندووە. باخ و باخاتی چڕوپڕیشمان تیا ڕواندووە.
میوە و لەوەڕیشمان تیا ڕواندووە. بۆ ڕابواردنی
خۆتان و ئاژەڵ و وڵاخەکانتان."

(عبس: ٢٥-٣٢)

# هەموو منداڵێك پێویستە درەختێکی هەبێت



لەوەتەی هەم حەزم بە یاریی تۆپێن نەکردووە. لە ڕاستیدا بۆیە حەزی پێ ناکەم، چونکە لە توانامدا نییە.

جاران، منداڵانی گەڕەک بە کۆمەڵ زوو زوو یـاریی تۆپێنیـان ڕێـک دەخسـت. بەڵام بەهـۆی دوو منـداڵەوە بەردەوام شـەڕ دروست دەبوو. یەکێک لەو دوو منـداڵە مـن بـووم، ئەوەی تـر جومهور بوو؛ کە یەکێک بوو لە یاریزانە باشەکانی تۆپێن.

لە کاتی بڕیـاردان بـۆ دابەشـکردنی تیپەکـان و دابەشـکردنی یاریزانەکـان کە دەهـاتە سـەرەی جومهـور، یـاریزانی تیپەکـان دەکەوتنە مشـتومڕ و دەمەقـاڵێ و دەیـانوت: "جـاری ڕابـردوو جومهور لەگەڵ ئێوەدا یـاری دەکـرد، ئەم جـارە دەبێـت لەگەڵ ئێمەدا بێت." بەم شـێوەیە درێـژەی دەکێشـا تـا شـەڕ دروسـت دەبوو.

کاتێک دەهاتە سەرەی هەڵبژاردنی من بۆ تیپەکانیان، دووبارە دەمەقاڵێ دەستی پێ دەکردەوە:

- جاری ڕابردوو لەگەڵ ئێمەدا بوو، ئەم جارە با لەگەڵ ئێوەدا بێت.

-بۆچی چییە! پێشتر لە دوو یاری لەسەر یەکدا لەگەڵ ئێمەدا بوو بەردەوام شکستمان دەهێنا، ئەم جارە نامانەوێت.



-دەڵێت لە یاریی پێشوودا سێ گۆڵم کرد!

-کردی کردی! سێیەم گۆڵی لە تیپەکەی خۆی کرد!

-نەخێر ئیتر!

پێش ئەوەی شەڕەکە بگاتە شەڕە بەرد، بڕیاریان دەدا کە بە "شێر و خەت" دیاری بکەن.

بەڵام هیچ کامیان دینارێک لە گیرفانیان دەرنەدەچوو، بۆیە بڕیاری "تەڕ و وشک" یان دەدا بۆ دیاری کردن.

بەردێکی ڕوو تەختیان دەدۆزییەوە و دواتر بە لیکی دەمیان تەڕیان دەکرد، پاشان هەڵیان دەدا و دەیانوت: "تەڕ یان وشک؟"

ئەوەی ناخۆش بوو ئەوە بوو، من بەردە ڕوو تەختەکەم دەدۆزییەوە و ئەوان بە لیکی دەمیان تەڕیان دەکرد...

منیش بە سەرکزی مەیدانەکەم بەجێ دەهێشت و وەکو مریشک لە ژێر لقی درەختە هەنجیرە بەتەمەنەکە خۆم گرموڵە دەکرد و هەموو هاوینەکەم لە ژێر سێبەری ئەو درەختەدا بەسەر دەبرد. کاتەکانم بە خەیاڵکردن، یان بە کتێب خوێندنەوە بەسەر دەبرد. پەرتووکی: (مرواری کەنار دەریا، گەڕان بە دوای کەشتییە شکاوەکەدا، پێڵاوی زیوی سەر سەهۆڵ، کوڕەکانی گەڕەکی پاوڵ)م دەخوێندەوە.

- تا ئێستا چیرۆکی ئەو درەختەم بۆ ئێوە باس کردووە؟

ئەگەر باسیشم کردبێت، نەکەن دەنگ بکەن. وتەی ئامادەکراوم هێناوە بۆ درەختەکان، ئێوە بەشداری مەکەن!

# هەموو منداڵێك پێویستە درەختێكی هەبێت

ڕۆژێک کاک **حەسنوو** بە دوو شەتڵ هەنجیرەوە دەچێتە ماڵی 'کاک جەمال'ی دراوسێی ، شەتڵێکیان سیس و لاواز؛ ئەوەی تریان قیت و قنج و بەهێز. ئەو کاتە من لەدایک نەبووبووم.

کاک حوسنوو شەتڵە لاواز و پێنەگەیشتووەکەی دا بە دەست کاک جەمالەوە و پێی وت: "ئەم شەتڵە هەنجیرە بگرە و لە باخچەکەی خۆتدا بیچێنە." من ئەو کاتە لەدایک نەبووبووم و کاتێکیش کە هاتمە دنیاوە، جەمال ئەفەندی کۆچی دوایی کردبوو.

کاتێک تەمەنم گەیشتە ئەوەی بتوانم بەسەر درەختێکدا سەر بکەوم، لە باخچەی پشتەوەی ماڵەکەماندا درەختێکی گەورەی هەنجیرم دۆزییەوە. جەمال ئەفەندی باپیرم بەزۆری لەبەر ئەم درەختە خۆش دەوێت، لە کاتێکدا هیچ ڕووخساریم نەبینیووە.

باپیرم لەبەر ئەوە خۆش دەوێت کە درەختێکی لەم جۆرەی بۆ بەجێ هێشتووم: درەختێک من بتوانم بەسەریدا سەر بکەوم، لە نێوان لقەکانیدا بتوانم دابنیشم و کتێب بخوێنمەوە. هەر لقێکی وەکو دەستێک وا بێت. لە کاتێکدا هەندێک جار ڕەنگە بریندارم بکات، بەڵام لە هاویندا سێبەرم بۆ دروست دەکات. لە نێوان

گەڵاكانیـدا بتـوانم خـۆم بشـارمەوە و نـوقمی خەیـاڵ بـبم، درەختێک کە میوەیەکم بۆ بەرهەم دەهێنێت بە تامی هەنگوین.

بە بڕوای من پێویستە هەموو منداڵێک درەختێکـی تـایبەت بە خۆی هەبێت! پێویسـتە پـێش سـاڵنامەی وەرزەکـان، منـداڵان لەسەر درەختەکان فێری وەرزەکان ببن...

درەختی هەنجیر، درەختی لیمۆ، درەختی هەنار...



هەمـوو منـداڵێک کە لە تەمەنـی منـداڵیی منـدا بـوو، ئەگەر بیویستایە درەختێکی تایبەت بەخۆی دەبوو.

بۆ نموونە، بەهادیر درەختێکی لیمۆی تایبەت بەخۆی هەبوو. بە درێژایی زستان لقەکـانی وشـک و ڕەش دەبـوو. درەخـتەکە

ئەوەنــدە گەورە بــوو، قەلەڕەشــە فێڵبازەکــان دەچــوونە ســەر لقەکانی و دەیانجوڵاندەوە، بەم هۆیەش لیمۆکان بەردەبــوونەوە بەسەر ئەو کەسانەی لەژێر درەختەکەدا هاتووچۆیان دەکـرد. لە ناوەڕاســـتی هاوینیشـــدا درەخـــتەکە گـــوڵی دەگـــرت و بۆنوبەرامەکەی هەموو ئەو گەڕەکەی دەتەنی...



یەشــیم، درەختــی گێلاســی هەبــوو. کاتێــک وەرزی بەهــار دەهــات، چۆلەکەکــان لەســەر قەدی درەخــتەکە دەنیشــتنەوە و ئاهەنگیان دەگێڕا و گۆرانییان دەوت.

فــاتمە درەختــی قەیســی هەبــوو. ئــامینە درەختــی شــۆڕەبی و حەســەن'یــش درەختــی تــوتڕکی هەبــوو؛ کە لقەکــانی لەسەر زەوییەکە ڕاکشابوون.

ئەو درەختەی کە بێ خاوەن بوو و موڵکی هەموومان بوو؛ با ئەمە درەختی هەموومان بێت، درەختی "قۆخ" بوو.

هەموو بەهارێک وەکو بووکی پەمەیی دەردەکەوت. وەک هەموو میوەکانی تر، ئاشقی تامی بووین و منداڵانی گەڕەک بە یەکسانی بەسەر یەکدا دابەشیان دەکرد و لێیان دەخوارد.

**نیل** درەختی هەڵووژە و **دورسون** درەختی بوندق و **مەریەم** درەختی تووی هەبوو.

لە سەردەمی ئێمەدا، هیچ منداڵێک پلەیستەیشن و ئایپاد و کۆمپیوتەر و مۆبایلی نەبوو، بەڵام هەموومان خاوەنی درەختێکی خۆمان بووین....

**ئەنەس** درەختی گوێز و **ئیرۆڵ** درەختی بەڕوو و **بێتول** درەختی هەنار و **ئێنیسیێ**'ش سنەوبەرێکی گەورەی هەبوو.

منیش هەر وەکو باسم کرد درەختێکی گەورەی هەنجیرم هەبوو...

بە بڕوای من پێویستە هەموو منداڵێک درەختێکی تایبەت بە خۆی هەبێت و پێویستە پێش ساڵنامەی وەرزەکان، منداڵان لەسەر درەختەکان فێری وەرزەکان ببن... پێویستە لە درەختی هەنجیر، لیمۆ، هەنار، بادەم، فستقەوە فێری ببن....



# نوور



پێشــینان دەگێــڕنەوە؛ بــوودای گەورە[1] پــاش دانیشــتنی بــۆ مــاوەی حەوت هەفــتە لە ژێــر درەختــی هەنجیــری هیندیــدا، نوورێکی بینیووە.

ڕاستە درەختی هەنجیری هیندیم نەبووە، بەڵام خــۆ درەختــی هەنجیرم هەبــوو. ئەگەر وەکــو مریشــک لە ژێــر درەختەکەمــدا گرمۆڵەم نەکردبایە و قاچ لەسەر قاچ دانیشتبامایە، ڕەنگە منــیش ئەو نوورەم ببینیبــایە. بــۆ نمــوونە ئەگەر منــیش بە ئاســوودەیی بمتوانیبــایە لە ژێــر درەختەکەمــدا کــولیچەیەکی پــڕ لە گــوێز و شوشەیەک ساردی بخۆم، ڕەنگە بمتوانیبایە ڕێگەیەک بدۆزمەوە تا کولیچە و ســاردی لە یەک کاتــدا بخورێــت و پــێکەوە تەواو بکرێت.

وەک دەزانــن کە شووشــە ســاردییەکە پــێش کــولیچەکە تەواو دەبێت و ئەو بەشەی کۆتایی کولیچەکە کە دەمێنێــتەوە -دەبێــت بە وشکی و بە زۆر- هەمووی بخۆین!

---

١ - بــوودا: بــریتییە لەو کەســەی کە ئــایینی بــوودی دامەزرانــدوە و شوێنکەوتوانی وەك خوداوەندێك دەیپەرستن.

له ڕاستیدا، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بـوو بێـت، مـن ئەو نوورەم بینیووە.

ڕۆژێــک لەســەر لقــی درەخــتەکە کەوتمە خــوارەوە. هەر ئەوەنــدەی ســەرم بەر زەویەکە کەوت، ڕوونــاکییەک هــاتە بەرچاوم؛ وەکو برووسکەیەک وابوو.

- ئەوە نوورانیبوون نییە.

- نوورانیبوون نییە؟ بۆچی نا؟ سوێند دەخۆم کە ڕووناکییەکم بینی، بەتایبەت ڕووناکییەکی ڕەنگ سپی بوو!

لە نێــوان هەمــوو ئەو درەختــی میــوانە، مــن درەختــی هەنجیــرم لە هەموویــان خۆشــتر دەوێــت. جــگە لەو هۆکــارەی کە ئەم درەخــتە وەکــو یادگــارییەکی منــداڵییە بــۆ من، چەندەها هۆکاری تریشی لە پشتە.

بەڵام دانی پێدا دەنێم کە هۆکـاری یەکەمـم بـۆ خۆشویسـتنی درەختی هەنجیر؛ ئەوەیە میـوەیەکمان دەداتــێ. تـامەکەی وەک هەنگوین وایە و لە ناویدا دەنکی بچـووک هەیە، کە بـێ زیـان دەتوانین دەنکەکانی بخۆین و پێویست ناکات دەری بهێنین.

هەنجیر ئەو دەنکە بچووک بچووکـانە لەخـۆ دەگرێـت کە لە کاتی خواردنیــدا لە نێـوان ددانەکانمانــدا دەمێنێـتەوە و چێـژ لە شیرینی هەنجیرەکەش وەردەگرین، کە وەک لوقم وایە.

بەڵام لێرەدا ناهەقی دەکەیـن بەرانـبەر ئەو نـیعمەتە جـوانە کە دەڵێین: "هەنجیرێک وەکو لوقم".

له ڕاستیدا ئەگەر مرۆڤەکان بیانەوێت لوقمێکی بەتام و چێژ دروست بکەن، ئەوا دەتوانن بڵێن: "لوقمێکی وەکو هەنجیر!" چونکە پێویستە شتە لاوازەکە بە شتە بەهێزەکە بچوێندرێت، یاساکە بەو جۆرەیە!

## گوڵە شاراوەکانی هەنجیر

- ئایا هیچ کاتێک گوڵی هەنجیرت بینیووە؟ نایبینیت!

بەڵام هەموو درەختەکانی میوە گوڵ دەگرن.

کاتێک وەرزی بەهار دێت، درەختەکانی گێلاس وەکو بووک خۆیان دەڕازێننەوە. قۆخەکان پەمەیی دەردەکەون. درەختی بادەم و هەنار و بەهی؛ ئەو درەختانەن کە لە وەرزی زستان و بەهاردا میوەکانی پێناگەن، بەڵکو دەبێت چاوەڕێی هاتنی وەرزی پایز بکەین، تا ئەو درەختانە گوڵەکانیان بگەشێنەوە و میوەکانیان بۆ خواردن بشێن.

- ئەی باشە هەنجیر؟ هەنجیری بێچارە گوڵ ناگرێت؟

بەدڵنیاییەوە درەختی هەنجیریش گوڵ دەگرێت، بەڵام وەکو درەختەکانی تر نییە کە لە دووریی پەنجا مەترەوە خۆیان نیشان بدەن و بڵێن: " من لێرەم". گوڵی درەختی هەنجیر لە نێوان لقەکاندا خونچە دەکات.

لە ڕاستیدا ئەو خونچانە وەکو سندووقێک وان کە لە داهاتوودا دەگۆڕێن بۆ میوەیەکی وەک هەنگوین، گوڵی هەنجیریش هەر لە ناو ئەو سندووقەدا خۆی حەشار داوە.

هەندێک لەو گوڵانە نێرن و هەندێکیان مێ. بۆ ئەوەی کە میوەی هەنجیر پێبگات و بەرهەمی زیاتر دروست بکات، پێویستە گوڵی نێر و مێ بەیەک بگەن. ڕاستتر بڵێین، پێویستە هەڵاڵەی گوڵە نێرەکە لەگەڵ گوڵە مێیەکە یەک بگرن!

خۆ ئەگەر گوڵی درەختی هەنجیر وەکو گوڵی درەختەکانی تر بووایە و هەر لە دوورەوە دەربکەوتایە، ئەو کاتە تەنها ڕەشەبا، یان مێشهەنگەکان، یاخود مێرووە جۆراوجۆرەکان ئەم کرداری پیتاندنەیان ئەنجام دەدا. بەڵام ئایا چۆن هەڵاڵەکانی گوڵی هەنجیر لەو سندووقەدا دەردەچن و چۆن تێکەڵ دەبن؟

ئەگەر ئەو هەڵاڵانە تێکەڵ نەبن، ئەوا میوەی هەنجیر هەرگیز پێناگات و لە ماوەیەکی کورتدا ڕەش هەڵدەگەڕێت و بەردەبێتەوە.

هەر بۆیە ئەم گواستنەوەی هەڵاڵانە زیندەوەرێکی تایبەت بە درەختی هەنجیر دەیکات، کە ئەویش زەردەواڵەی هەنجیرە.

هەر وەک چۆن کەسێک پەیمانی هاوسەرگیری دەنوسێت و دوو کەس بە یەک دەگەیەنێت، بە هەمان شێوە ئەم زەردەواڵانە گوڵە نێر و گوڵە مێیەکان بەیەک دەگەیەنن.

- یاخود جارێ زۆر بە جوانی لەم پرۆسەیە تێناگەن!

هەر بەم بـــۆنەیەوە بیســـتوومە دەڵـــێن زەردەواڵەکـــان هـــیچ کارێکیان پێ ناکرێت؟ زۆر مایەی شەرمە!

## هاوڕێیەتییەک بە ئەندازەی ٨٠ ملیۆن ساڵ

ئەگەر بەراوردی نێـــــوان زەردەواڵە و زەردەواڵەی هەنجیـــــر بکەیـــن، ئەوا دەبینـــین کە زەردەواڵەی هەنجیـــر زۆر بچـــووکن، باڵایان ١-٢ مم دەبێت و بەئاسانی نـــاتوانین بیـــانبینین، چـــونکە زۆربەی کاتەکانیان لە ماڵەکانیاندا بەسەر دەبەن.

نێـــرە و مێـــیەی ئەم زەردەواڵانە، تەنهـــا لە نـــاو خـــونچەی هەنجیرەکاندا ماڵ بونیاد دەنێن و لەوێدا دەژین، هێلکەکانیشیان هەر لەوێ دادەنـــێن. واتـــا ئەوێ دەکەن بە مـــاڵی خۆیـــان. شتومەکەکانیان دەگوازنەوە و بەدڵنیـــاییەوە لەگەڵ گواســـتنەوەی شتومەکەکانیان ئەو هەلاڵەیەشیان پێیە کە لە هەنجیرەکانی ترەوە هێناویانە.

زەردەواڵەی هەنجیر، لە خـــانوویەکی خنجـــیلانە و پـــارێزراودا دەمێنـــنەوە، بـــۆ ئەوەی کە گـــوڵی هەنجیـــر پێبگـــات و ببێـــت بە هەنجیرێکـــی تـــام هەنگـــوینی، زەردەواڵەکـــان پێویســـتیان بەو هەلاڵانە دەبێت.

دوای ماوەیەک، زەردەواڵە نێرەکە تونێلێک دروست دەکات و دەچێتە دەرەوە.

ئەو زەردەواڵە ساوایانەی کە لە هێلکەکانیان دێنە دەرەوە (ئیتر خۆتان پێشبینی بچووکیی ئەو زەردەواڵانە بکەن) ئەگەر ئەو تونێلە بدۆزنەوە، ئەوا ئەوانیش دەردەچن و ئەگەریش نەیدۆزنەوە ئەو کاتە لەناو هەنجیرەکەدا دەمێننەوە.

هەنجیر گەورە گەورە دەبێت تا پێدەگات و تامی وەکو هەنگوین شیرین دەبێت. ئەو زەردەواڵە بچووکانەش دەخورێن، بەڵام هیچ خۆتان تووشی دڵەڕاوکێ مەکەن، چونکە ئەوان نە دەبینرێن، نە هەستیشیان پێ دەکرێت.

بەڵام ئایا هەر شەکر و هەر شەکر دەبێت؟ ئایا مرۆڤ پێویستی بە گۆشت و پرۆتینیش نابێت؟ کەواتە فەرموون هەردووکی بەیەکەوە.

گیانی هاوکاریکردن لە نێوان هەنجیر و ئەو زەردەواڵە بچووکانە دەگەڕێتەوە بۆ ٨٠ ملیۆن ساڵ، کە یەکێکە لە جوانترین و تایبەتترین(جا کامیان وانییە؟!) میوەکانی سەر ڕووی زەوی. چەندین سەدە بەر لەوەی مرۆڤەکان بیدۆزنەوە، ئاژەڵەکان بە گەورە و بچووکیانەوە گەدەی خۆیان پێ تێر دەکرد.



## پێکهاتە سەرەکییەکانی هەنجیر!

لە وڵاتە جوانەکەی ئێمەدا، پێنج بۆ دە جۆری جیاواز هەنجیر بوونی هەیە، بەڵام لە سەرانسەری دنیادا زیـاتر لە ٧٠٠ جـۆری هەنجیر بەردەستە.

زیـــاتر لە ١٠٠٠ جـــۆری زینـــدەوەران، چ ئەوانەی دێـــن و دەگەڕێــن، چ ئەوانەی دەفــڕن، لە کـاتی برسـێتیدا بە هەنجیـر خۆیـان تێـر دەکەن. لەم بـابەتەدا هـیچ درەختێـک ناتوانێـت پێشبڕکێی داری هەنجیر بکات و وەکو ئەو بێت.

ئاژەڵەکانی وەک چۆلەکەکان و شەمشەمە کوێرەکان و جۆرەکانی مەیموون؛ لە پلەی یەکەمی ئەو زیندەوەرانە دێن کە حەز بە میوەی هەنجیر دەکەن. بەدڵنیاییەوە زیندەوەرە بچووکەکانی وەک مێرووولەکانیش بێبەش نەبوون لەو هەنگوینە موعجیزەیە.

ڕووەکناسەکان باس لەوە دەکەن ئەگەر ڕۆژێک بێت و درەختی هەنجیر نەمێنێت، یاخود میوەکەی لەناو بچێت، ئەوا کێشەیەکی زۆر گەورە لە سیستمی ژینگەییدا (ئیکۆسیستم) ڕوو دەدات و ژینگە تووشی ڕووخان و دارمان دەبێت . چونکە هەنجیر پێکهاتەی سەرەکی خۆراکی زیندەوەرەکانە، هەروەها پێکهاتە خۆراکییە سەرەکییەکانی ژیانیش دابین دەکات و ڕۆڵێکی بەهێزی دەبێت لە بازنەی خۆراکیدا.

چییە ئەوە؟ دەڵێی وا بیرتان کردووەتەوە کە هەنجیر هەبێت یاخود نەبێت، بیخۆم یاخود نەیخۆم چی دەگۆڕێت؟



## درەختی ژیان، درەختی هەنجیرە

لە ئەنجامی ئەوەی کە هەنجیر سکی هەزارانی تێر کرد، ئەو دەنکە ورد وردانەی ناو هەنجیر بە ئاسانی بڵاو دەکرێنەوە. تۆوی هەنجیر ڕێژەیان زۆرە و لە قەبارەدا زۆر بچووکیشن، کە دەتوانن بە کۆئەندامی هەرسی ئاژەڵەکاندا تێپەڕ ببن و بێنەوە ناو خاک.

دوای سووتانی دارستانەکان، درەختی هەنجیر تاکە درەختە کە گەڵاکانی دێن و دەچن و وەکو دەستێکی زەبەلاح دەست بەسەر گردە ڕەش هەڵگەڕاوەکاندا دەهێنن.

دوای هەڵگیرسانی گڕکانەکـان، دووبـارە هەر لقـی درەختـی هەنجیـــرە کە دەڵێـــت: "ســـڵاو" و ئەو لێـــوارە پـــڕ ئـــاگر و خۆڵەمێشـــییانە بەســـەر دەکـــاتەوە، کە بەهـــۆی گڕکانەکـــانەوە سووتاون.

دوای مـــاوەیەکی کەم کە هەنجیـــر نـــاوچەکەی داپۆشـــی، بە میـــوەکەی ســـەرنجی ئاژەڵەکـــان بەلای خۆیـــدا ڕادەکێشـــێت و دواتریش لەگەڵ ئاژەڵەکاندا توخمی ڕووەکەکان بەلای خۆیـدا ڕادەکێشێت. گۆڕانییە سەرنجڕاکێشەکانی ژیان لەو شـوێنەی کە وەستابوو دەست پێ دەکاتەوە.

## لەسەر بەردیش بێت، هەنجیر هەر دەڕوێت

لە ماڵە چۆڵکراوەکان و شـارە ڕووخـاو و خاپووربووەکـان، لە پشت حەوشە بەردینەکان، لە نێـوان دیـوارە شـەق بردووەکـان؛ دووبارە هەر درەختی هەنجیرە کە گۆرانی دەڵێت بۆ ژیان.

ئەم پەندەش " لەسەر بەردیش بێت، هەنجیر هەر دەڕوێـت. " واتاکەی لەوەوە هاتووە؛ کە درەختی هەنجیر لە هەر شـوێنێکدا بێت دەڕوێت و خۆی لەگەڵ ژینگەکەی دەگونجێنێت.

چونکه له هەر شوێنێک کارێکی نا مرۆڤانه و وێرانکارییەک هەبوو بێت، ئەوا ڕاستەوخۆ درەختی هەنجیر له نێوان بەردەڵانەکاندا خۆی نیشان داوه و دەستپێشخەری کردووه.

هەنجیر لەم بابەتەدا ئەوەندە بە کارامەیی بونیاد نراوه، که هەزارەها ساڵ لەمەوپێش شارە کۆن و پشتگوێخراوەکانی "وادی السند" و "هەڕەمەکانی مایا له گواتیمالا" و "پەرستگای خەمیر له کەمبۆدیا" بە لق و گەڵاکانی درەختی هەنجیر داپۆشرابوون، چونکه ڕەگی درەختەکە له ناو کانە بەردەکانیشدا گەشەیان کردبوو و بڵاو بووبوونەوه. ئەم شوێنەوارانەش لەلایەن ئینديانا جۆنس **"Indiana Jones"**ەوه دۆزرانەوه، که پێش ئەوه بۆ ماوەی سەد ساڵ بوو کەس درکی پێ نەکردبوون.

## التین(هەنجیر)

هەنجیر، له واتاکەیەوه به گەنجینەی خۆراکی ناسراوه. هەر له شارستانییە کۆنەکانەوه خەڵکی گرنگیان بە هەنجیر داوه و وەکو سەرچاوەیەکی وزه دیارییان کردووه، هەر لەبەر ئەمەش خەڵکانی میسر و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، زیاتر له هەموو میوەکانی تر گرنگی بە هەنجیر دەدەن.

له باخچه هەڵواسراوەکانی بابلیش درەختـی هەنجیـر بـوونی هەیە.

ڕۆمانییه چاو برسی و نەوسـنەکانیش ئامـادە بـوون وڵاتێـک داگیر بـکەن، تەنهـا لەبەر ئەوەی درەختێکـی بەتـامی هەنجیـر پێدەگەیەنن. زۆربەی زۆریان هەنجیـر وەکـو میـوەیەکی پیـرۆز دەبینن و باوەڕیان وایه که ئەم میـوەیه له بەهەشـتەوە هـاتووەته سەر زەوی.

له ڕاستیدا نازانین ئایا هەنجیر له بەهەشـتەوە هـاتووە یـاخود ڕاســـتەوخۆ لەســـەر زەوی پێگەیشـــتووە، بەڵام که چـــووینه بەهەشــت دەتـوانین دڵنیـا ببیـنەوە به بەراوردکردنـی درەختـی هەنجیری بەهەشت به هەنجیری دنیا.

هەنجیر میوەیەکه هەم بەتام، هەم پـڕ ڤیتـامین و کـانزایه. هەر گەڵایەکـــی وەکـــو دەســـتێکی گەورە وایه و قەدە ئەســـتوور و زەبەلاحەکەشی بۆ ماوەی ۸۰ ملیۆن ساڵه هەنجیر پێشکەش به زیندەوەرەکان دەکات. هیچ درەختێکی تر ناتوانێت به ئەندازەی درەختی هەنجیر خزمەت به زیندەوەران بکات.

هەنجیر ئەوەندە تایبەت و گرنگە، ببینن چۆن خـودای گەورە ســـوێندی پـــێ دەخـــوات و له ســـوورەتی "التـــین" هەنجیـــردا دەفەرموێت: "ســوێند به هەنجیـر و به زەیتـوون! ســوێندیش به کێوی (توور)ی سینا! سوێندیش بەم شاری ئەمـین و کەس تیـا

نەترساوە کە مەککەیە! سوێند بە هەمموو ئەمانە! ئێمە ئادەمیزادمان لە جوانترین شێوەی ڕێکوپێکیدا دروست کردووە." (التین: ١-٤)



# ساتێك بۆ درەختەكان



دەڵــێن هەواڵـــی نـــاخۆش زوو دەبیســـترێت، بەڵام بـــۆ بڵاوبـــوونەوەی هەواڵێكـــی دڵخۆشـــكەر لە دڵەوە بـــۆ دڵ، لە زوبانەوە بۆ زوبان، پێویستمان بە كەسانێكە كە بە بینـین یـاخود بیستنی ئەو هەواڵانە شادومان بن.

ئەگەر ڕۆژێـك ڕۆژنـامەیەک دەربـكەم، ئەوا نـاوی دەنـێم "ڕۆژنـــامەی هەواڵە دڵخۆشـــكەرەكان" و تەنهـــا هەواڵـــی دڵخۆشكەری تێدا بڵاو دەكەمەوە.

چەنــد مانگێــک لەمەوپــێش، لە ڕۆژنامەكانــدا چـــاوم بە هەواڵێكی دڵخۆشكەر كەوت؛ لە ئەدەنا درەختێكی ٨٠٠ ساڵی زەیتوون لەلایەن چەند داربڕێكی بێبەزەییەوە بڕابووەوە و دواتـر فرۆشرابوو بە كارگەیەكی وردكردنی دار و درەخت لە مێرسین.

٨٠٠ ساڵ بوو، بەڵێ! واتە كاتێـک ئەو درەخـتە تـۆو بـووە و كەوتووەتە سەر زەوی، ساڵی ١٢١٧ بووە.

ئەوەنـدە درەختێكـی بەتەمەن بـووە! كە وەكـو ئاسـەوارێكی مێژوویی پێوانە دەكرا!

ئێستا ئێوە دەڵێن: "ئەمە هەواڵە دڵخۆشکەرەکە بوو؟ بەڕاستی ئەمە کارەساتە!" بەڵام چاوەڕێ بکەن و گوێ بۆ کۆتایی چیرۆکەکە ڕابگرن.

لە کارگەکەدا، داربڕەکە خەریکی بڕینی قەدی درەختە زەیتوونە بەتەمەنەکە بوو، تا ئەو کاتەی فەرمانبەرێکی شارەوانی درەختە گەورەکەی بینی و سەیری کرد کە هێشتا ڕەگی درەختەکە بە درەختە گەورەکەوە ماوە، ئەمەش بە واتای ئەوە دێت کە ئەو کەسانەی درەختەکەیان فرۆشتبوو بە کارگەکە، تەنها درەختەکەیان نەبڕیبووەوە، بەڵکو ڕەگی ئەو درەختە ٨٠٠ ساڵەیان لە بنەوە دەرکردبوو. فەرمانبەرەکەش دوای بینینی ئەم ڕووداوە ڕاستەوخۆ بەرپرسانی ئاگادار کردەوە، ئەوانیش بابەتەکەیان بە هەند وەرگرت و درەختە ٨٠٠ ساڵەکەیان -کە کێشی ٤ تەن بوو- گواستەوە بۆ باخچەیەک و لەوێ ناشتیان، لەگەڵ ئەوەشدا درەختەکەیان لەگەڵ درەختێکی گەنجدا موتوربە پێ کرد.

باشە موتوربەکردنەکەی سەرکەوتوو بوو؟ نەک هەر سەرکەوتوو بوو، بەڵکو دوای ٢٠ مانگ دەستی کرد بە پێدانی زەیتوون لە قەدە بەتەمەنەکانی.

ئەمەش ڕاستە لە خۆڕا نییە بە درەختی زەیتوون دەوترێت"درەختی نەمر!"

منـــيش بەم هەواڵە دەڵــێم هەواڵـــی دڵخۆشـــکەر! ئەگەر ڕۆژنـــامەیەکیش دەربـــکەم، ئەوا نـــاوی دەنـــێم ڕۆژنـــامەی هەواڵە دڵخۆشـــکەرەکان و هەمیشـــە لەو جـــۆرە هەواڵانەی تیایدا بڵاو دەکەمەوە.

بەڵام شتێک لە مێشکی مندا قەتیس بووە ، ئایا لە لای ئێوەش وایە؟ ئەو کەسانەی گرنگییان بەم بابەتە دا، باشە دەبێـت چـۆن زانیبێتیان کە ئەو درەختە زەیتوونە تەمەنی ٨٠٠ ساڵە؟ کـێ ئەو زانیارییەی پێ دابوون؟

بەڵێ، لە ڕاستییدا ئەو قەدە گەورانەی درەختەکە دەریـدەخات تەمەنـی درەخـتەکە چەنـدە. واتـا چـۆن! ئەوان بە پێشـبینییەک تەمەنی درەختەکەیان دۆزییەوە؟

-گەورەم بڵێـــین تەمەنـــی چەنـــدە؟ چـــونکە هـــاوڕێ ڕۆژنامەوانەکانمان دەپرسن.

- بڵێین چەندە؟

- بڵێین چەندە گەورەم؟

- بنووسە ٧٠!

- ئەوە کەمە گەورەم، باپیرم ٧٠ ساڵ بوو!

-کەواتە بنووسە ٧٠٠!

-گەورەم هەر کردووتە کردووتە، با بیێتە ٧٩٠ !

- ئەوە چیـیە ؛ دەڵێـی چـوویتەتە داشـکاندنێکی درۆوە بـۆ تاقمێکی مۆبیلیات! بیگۆڕە ئەوە، بیگۆڕە!

- ٨٠٠ باشه گەورەم؟
- ئەی ئەگەر وتیان لە کوێ زانیووتانە، دەڵێن چی؟
- گەورەم، دەڵێـین بەڕێـوەبەری نفـوس ئەو زانیـارییەی پـێ داوین.
-بیرۆکەیەکی ژیرانەیە.
بەدڵنیاییەوە بەو جۆرە بڕیاریان لە تەمەنی ئەو درەختە زەیتوونە بەتەمەنە نەداوە، چونکە چەنـد ڕێگەیەکـی پـارێزراو و زانسـتی هەیە بۆ دیاریکردنی تەمەنی درەختەکان.

## شوێنەواری چەندەها ساڵ

ئاسـانترین ڕێـگە بـۆ دیـاریکردنی تەمەنـی درەختێـک کە لە لێپرسراوێکی دارستانەکانەوە فێری بووم، بریتییە لەوەی سـەرەتا مەترێک هەڵدەگرین و پێوانەی تیـرەی قەدی درەخـتەکەی پـێ دەکەین؛ بە بەرزی ١,٥ مەتر لە زەوییەوە.
بابڵێین پێوانەتان کرد و ١٢٠سم دەرچوو، ئێستا ئەو ١٢٠سم دابەشی ٢,٥ بکەن، ١٢٠ دابەشی ٢,٥ یەکسانە بە ٤٨.
کەواتە ئەمە ژمارەی ئەو مۆمانەیە کە بۆ ڕۆژی لەدایکبـوونەکە لێتان داوا دەکرێت.
ئەی باشە بۆچی لە ١,٥ مەترەوە تیرە وەردەگرین و دەیگۆڕین بۆ سانتیممەتر و دابەشی ٢,٥ی دەکەین؟

ڕاستی لەم بابەتەدا هیچ زانیاریم نییە.

لە ڕاستیدا، وەکو ئەوەی کە لێپرسراوی دارستانەکە وتی؛ ئەم شێوازە کردارە پێویستی بە ڕاهێنانێکی زۆرە. بەڵام ئەوەندەش باوەڕپێکراو نییە، چونکە ئەگەر بەراوردی درەختەکان بکەین، دەبینین کە هەندێکیان زووتر گەشە دەکەن و هەندێکی تریان هێواشتر گەشە دەکەن. ئێمە ناتوانین تەمەنی ئەوان بەو شێوازە دیاری بکەین.

دروسترین ڕێگە بۆ زانینی تەمەنی درەختێک، بریتییە لەوەی کە قەدەکەی لە باری پانیدا ببڕیت و خەتەکانی ناوەوەی کە بە شێوەی بازنەیی نەخشێندراوە؛ بژمێریت.

ئایا ئێوە پێشتر درەختێکتان بینیووە کە قەدەکەی لە باری پانیدا بڕابێتەوە؟ درەخت لە ناوەڕاستی قەدەکەیەوە بۆ دەرەوەی، کۆمەڵێک خەتی شێوەی بازنەیی بوونی هەیە، ژماردنی ئەو خەتانە تەمەنی درەختەکەمان نیشان دەدات.

بەڵام زۆر زیاتریش بوونی هەیە...



گەورەبوونی درەخت لە وەرزی زستاندا خێراتـر دەبێـت، هەر هـیچ نەبێـت لە بـاکووری زەویـیەوە جیـاوازیی گەشــەکردنی درەختەکان بەپێی تێپەڕبـوونی وەرزەکـان دەبینرێـت. لە وەرزی زسـتاندا ئەو بەشــەی درەختەکـان کە گەورە دەبـن، ڕەنگێکـی کاڵیان دەبێت. لە وەرزی هاوینیشدا درەختەکان هێواشتر گەشە دەکەن و ڕەنگی بازنەی ناو درەختەکانیش تـۆخ دەردەکەون، کە ئەمەش گەشەکردنی درەختەکە نیشان دەدات، بەم جۆرەش کاڵ و تۆخی ڕەنگی بازنەکان تەمەنی ساڵێکمان نیشان دەدات.

هەندێک جار لەناو بـازنەی درەختەکانـدا درز و شـەق بـوون دەبینین، کە ڕەنگە ئەو درزانە بەهۆی داربڕێکەوە ڕووی دابێت. بۆ نموونە؛ ڕەنگە ئەو درزە لەلایەن داربڕێکەوە بـوو بێـت کە بە تەورەکەی لە قەدی درەختەکەی داوە، بەڵام لەو کـاتەدا دەنگـی تەورەکەی گەیشـــــتووە بە ورچێـــــک و لە خەو خەبەری کردووەتەوە. لەمەوە وا دەردەکەوێت کە داربـڕەکە پـێش ئەوەی دارەکە ببڕێتەوە خۆی لە ورچەکە ڕزگار کـردووە . بەدڵنیـاییەوە ناتوانین دڵنیا ببین لەوەی ئایـا داربـڕەکە ڕایکـردووە لە دەسـت ورچەکە، یاخود نا! بۆ ئەمەش پێویسـتە لە فەرمـانگەی ئامـاری دانیشتووان ئەو زانیارییە بەردەست بخەین.

ئەگەر بێت و هەورە برووسکەیەک بەر درەختێـک کەوتبێـت، یـاخود ئـاگرکەوتنەوەیەک بەسـەر دارسـتانێکدا هاتبێـت، ئەوا دەشـێت لە ئاسـەواری بازنەکـانی قەدی درەخـتەکەوە بیـزانین.

تەنها ئەوەندەش نا، بەڵکو دەتوانین زانیاریمان لەسەر درەختێکی سەد ساڵی دەست بکەوێت کە سەد ساڵە وەرزەکانی بەسەردا تێپەڕیووە.

یاخود بۆ نموونە، ئەگەر هاتوو هەشتایەمین بازنەی ناو قەدی درەختەکە زیاد لە پێویست ڕەنگی تۆخ بوو، ئەوا بە واتای ئەوە دێت کە ئەو ساڵە وشکەساڵی بووە و وەرزی زستان کورت بووە؛ وەرزی هاوین درێژ بووە.

بەڵام یەک خولەک ڕاوەستن! واتا بۆ ئەوەی ئەو هەموو زانیارییە بزانین دەربارەی درەختێک؛ دەبێت درەختەکە ببڕینەوە؟

نەخێر! بەڵکو لێپرسراوی دارستانەکان، یاخود ڕاستر بڵێین "دێندرۆکرۆنۆلۆجیست"ەکان[1]، نایەن ئەو درەختە ببڕنەوە کە چاویان لەسەرە و دەیانەوێت زانیارییان دەربارەی دەست بکەوێت، بەڵکو ئامێری هەڵکۆڵ بەکار دەهێنن، کە بەو ئامێرە نموونەیەکی بچووک لە قەدی درەختەکە وەردەگرن. ئەم کردارەش هیچ زیان بە درەختەکە ناگەیەنێت. دواتر ئەو نموونەیەی لە درەختەکە وەری دەگرن، پشکنینی بۆ دەکەن و ژمارەی بازنەکانی دەژمێرن.

---

١- ئەو کەسانەن کە دەیانەوێت زانیارییان دەربارەی ڕابردووی درەختێک دەست بکەوێت.

ڕەنگە بەلای دارتاش یان داربڕێکەوە ئەو پارچە درەختە تەڵاشدارێک یان پەلێکی باریک بێت بۆ سووتان، بەڵام بۆ دێندرۆکرۆنۆلۆجیستێک ئەو پارچە درەختە وەکو **هارد درایڤێکە** کە تەواوی زانیاریی درەختەکە لەخۆ دەگرێت.

بوون بە دێنترۆکرۆنۆلۆجیستیش کارێکی چەند بەجۆشە؛ ئەی وانییە؟ تەنها ئەوەندەی هەیە کەمێک بە زەحمەت وەڵامی ئەو کەسەت پێ دەدرێتەوە کە پرسیاری ئیشەکەت لێ دەکات.

- پیشەتان چییە، کوڕم؟

-هین....من.... دێندرۆکرۆنۆلۆجیستم.

- بارەکەڵڵا، بڕوانە پزیشکە ئیتر.

- نا نەخێر، بەو شێوەیە نییە! من چاودێریی درەختەکانم.

-ئێێ کوڕم بڵێ لێپرسراوی دارستانم.

- لە ڕاستیدا لێپرسراوی دارستان نییە ، دێندرۆکرۆنۆلۆجیستە!

-خۆزگە یورۆلۆجیست (پزیشکی کۆئەندامی میز و میزەڕۆ) بوویتایە! دووبارە کۆئەندامی میزەڕۆم ناڕەحەتی کردووم.

-شششت، پیاوەکە شورەییە.

- ئای لێپرسراوی دارستان، گیانم لێپرسراوی دارستان.

- باوکە گیان تکایە.

- باشە باشە کچەکەمان دایتێ و تەواو بوو!

له ڕاستیدا بابەتەکە بەو شێوەیە ئاڵۆز نییە، بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەگەر تەماشای ناوەڕۆکی وشەی دێندرۆکرۆنۆلۆجیست بکەیت، ئەوا کەمێک سەرت لێ دەشێوێت. لەبەر ئەوەی وشەی دێنتدرۆن لە یۆنانیدا بە واتای درەخت دێت و وشەی "کرۆنۆسیش" بە واتای کات دێت، کەواتە کۆی وشەکان بە واتای کاتی درەخت دێت...



# درەختی نەمر



لە نێوانماندا هیچ تووڕەبوونێک یاخود نائومێدییەک نییە، سوپاس بۆ خودا شەڕیشمان نەکردووە و لە یەکمان نەداوە. نە من یاومەتەوە بە سەروچاوی ئێوەدا و نە ئێوەش بەردبارانتان کردووم. نە وشەیەکی خراپ لە دەمم هاتووەتە دەرەوە بەرانبەر ئێوە، نە ئێوەش بێڕێزییەکتان بەرانبەر من نواندووە. دڵگرانبوون و شتی وا حاشا! بۆ چ هۆکارێک؟ وەکو گوڵ دێین و دەچین.

سەیر بکەن، دانیشتووم پەرتووکێکی نوێ دەنووسم، بۆچی؟ تەنها لەبەر ئەوەی ئێوە خۆشتان دەوێت، بەڵام دووبارە درێژە دەدەم بە بابەی "لقی زەیتوون" بەڵێ لقی زەیتوون! لقێکی زەیتوون و گەڵا پاک و درەوشاوەکانی هەنار کە وەک زیو دەدرەوشێنەوە.

لقێکی ئەو زەیتوونانە بهێنن و وەرن لەگەڵم با بڕۆینە باخچەیەکی زەیتوونەوە؛ لەوێ بەتەمەنترین درەختی زەیتوون بدۆزینەوە و لە ژێر سێبەرەکەیدا بۆ ساتێک دابنیشین و پاڵ

بـدەینەوە. ڕەنـگە وەکـو "هـۆمیرۆس"ی نووسـەر لە ژێریـدا سەرخەوێک بشکێنین.

درەختە زەیتوونە بەتەمەنەکە، وەکـو تـابووتێکی کـۆن وایە کە خاوەنەکەی لە نیوەی ڕێگەدا بەجێـی هێشـتووە و نەگەڕاوەتەوە بـۆ لای و هـۆنراوەیەک بە گوێمانـدا دەچپێنێـت، کە وەک ئـاڵتوونێکی تـۆز لەسەرنیشـتوو وایە و دەڵێـت: "هـی هەمـوو کەسێکم و هی هیچ کەسێکیش نیم، پێش ئەوەی ئێوە بـێن مـن هەر لێـرە بـووم، دوای ئەوەی کە ئێـوەش دەڕۆن مـن هەر لێـرە دەمێنمەوە."

- هێی!هێی! سەیری من بکە!
- بسم الله الرحمن الرحیم! کێ قسەی کرد؟
- لەگەڵ تۆمە!
- بەڵام ئەمە درەختێکی بەتەمەنی زەیتوونە!
- خۆت بەتەمەنی!
- زۆر بەتەمەن دەردەکەون، درۆیە؟
- من تەمەنم ٢٥٠ساڵە.
- بەڕاستە؟
- بۆ درەختی زەیتوون تا چەند ساڵ دەژی؟
- چەند ساڵ؟
- ئەگەر ئـاگر نەمانسـوتێنێت، داربڕەکـان نەمـانبڕنەوە، گورگەکان نەمـانخۆن، ئـێمە نـامرین بـۆیە بە ئـێمە دەوترێـت: "درەختی نەمر"

- چی دەڵێن؟ بەڕاستتانە؟
- بەڵام خـۆ وازنـاهێنن! لەوێ نووسـینگەیەکی خـانووبەرەی لێیە! خاوەنەکەی پیاوێکی سەر زلە. جـاری پێشـوو هـاتە لای خـاوەنی ئەم شـوێنە و پێـی وت: "لە بەرانـبەر ئەو درەخـتە زەیتوونەدا ئەوەندەت پارە دەدەمێ" مەبەستی من بوو!
- بەتەمایە چی بکات؟
- دروستکردنی خانوویەکی خستووەتە مێشکییەوە، سـەرێکی ئەوەندە گەورەی هەیە کە لە هیچ شوێنێکدا جێگای نابێتەوە!
- خاوەنی شوێنەکە وەڵامی چی بوو؟ باخچەی زەیتوونەکـان دەفرۆشێت؟
نەخێر!
- ئێهـ...باشتر!
-دەڵێت دەیکەمە هۆتێل، هۆتێل پارەیەکی باش دەکات!
- وا مەڵێ!
- لە کۆتاییدا ئیتر مرۆڤانێکی ناسوپاسگوزار و چاوبرسین.
- بەڵام هۆتێل گرنگە؛ گەشتیار، کارگەیەکی بێدوکەڵ!
- ئەی ئێمە چین؟ کارگەی ڕاستەقینە ئێمەین! خـودای گەورە ئێمەی وەکو کارگەیەک بونیاد ناوە! کارگەی زەیتوون.
- باشە بەڵام ئەگەر بەم شێوەیە لێی بڕوانی...
- تۆ ئەو گڵە بگرە بە دەستەوە!

- هەڵیبگرە! هەڵیبگرە! ئینجا تەڕی بکە، لەناو دەستتدا ئەمدیو و ئەودیوی پێ بکە! ئێستاش یەک زەیتوونم بۆ دروست بکە، با بتبینم!

- ئێێێێێ... چۆن دروستی بکەم؟ کەس ناتوانێت ئەوە بکات.

- بیبەرە لای پڕۆفیسۆرەکان، با ئەوان دروستی بکەن!

- نەخێر ئیتر، ئێستا پڕۆفیسۆرێکی ئاوا لە کوێ بهێنم؟

- سەیری من بکە، لەسەر بەرزی ئەو گردە خزمێکی منی لێ بوو، ٥٠٠ ساڵ تەمەنی بوو. ڕۆژێک داربڕەکان هاتن و بڕییانەوە و لەگەڵ خۆیاندا بردیان.

-هیییی!

-بەڵێ... تەنانەت چۆلەکەکانیش بە دوایدا گریان!

-سەیر بکە منیش ئێستا دەگریم ها!



-ئێستا تۆ دەڵێیت مەگری، چونکە بێسوودە؟

- ئەی باشە کەی پێویستە بگریم؟

- ئەو کـاتەی کە کۆتـا درەختـی زەیتـوون بـڕایەوە و لە پێنـاو بوونی یەک زەیتوون لە دەفرەکانتانـدا، پێویسـت بکـات بـڕۆنە سەر گردەکان و بگرین.

-ئەی خودایە! ئەوە چ کابووسێکی خراپ بوو!

## گەورەی درەختەکان

کەشتییەکەی پێغەمبەر نوح (سەلامی خوای لەسەر بێـت) بـۆ ماوەی چەند ڕۆژ و هەفتە و سـاڵێک لە تاریکـایی دەریاکـان و بەرزی شـەپۆلەکان -کە وەک شـاخەکان وابـوون- مـایەوە، لە کۆتاییدا لەسەر شاخی **جودی** وەستایەوە.

لافاو و زریانەکان تەواو بوون، شەپۆلەکان وەستان، تارمـایی هەورە ڕەشـەکان وەکـو هەورەکـان دیـار نەمـان و ئاسـمان بە ڕوونـاکییە شـینەکەی زەردەخەنەی بەخشـی، گڵـۆپە زەردە گەرمەکەی خوداش دووبارە زەوی وشک و ڕووناک کردەوە.

دەڵێن لەو کاتەدا کۆترێک لە کەشتییەکەوە فڕیـوە. فڕیـوە و لە کـاتی گەڕانەوەیـدا بە دەنـووکی زەیتـوونێکی هەڵگرتـووە، ئەو زەیتوونەش مژدەی کشانەوەی ئاوەکە بووە...

درەختی زەیتوون هەزارەها ساڵە گرنگییەکی زۆر زیاتری هەبووە لای مرۆڤەکان بە بەراورد بە میوەکانی وەک؛ سێو و هەرمێ و قۆخ، کە ڕەنگە بە لقەکانەوە پێگەیشتبێتن یاخود نا.

چونکە ئەو زەیتەی لە میوەی زەیتوونەوە وەردەگیرێت کە زەیتی زەیتوونە، چەندەها سەدەیە بووەتە مایەی ڕووناککردنەوەی شەوی مرۆڤەکان، چونکە وەکو سەرچاوەیەکی وزە بۆ داگیرساندنی چراکان لە ماڵەکان و پەرستگاکان و کۆشکەکاندا بەکاریان هێناوە.



بەدڵنیاییەوە زەیتی زەیتوون وەکو وزەی نەوت نییە، ئەو لە هەمان کاتدا دە پلە لە نەوت تەندروستترە. ڕەنگە ئێستا هیچ کەسێک زەیتی زەیتوون وەکو وزەیەک بۆ ڕووناککردنەوە بەکار نەهێنێت، بەڵام زەیتی زەیتوون ئێستاش لەسەر سفرەکانماندا هەیە. هەر وەک چۆن هۆمیرۆسی نووسەر بە "شلەی ئاڵتوونی" ناوی دەبات. تا دنیا بمێنێت هیچ کەسێک ناتوانیت لە نرخ و شکۆی درەختی زەیتوون کەم بکاتەوە.

ئەو خواردنانەی کە بە زەیتی زەیتوون دەکرێن(خۆشترین خواردن لای من کە بە زەیتی زەیتوون دەکرێت بریتییە لە یاپراخ) هەم تەندروستر، هەمیش زۆر بەلەزەتترن.

لە پێکهاتەکەیدا ڤیتامین K,D,E و بە هەمان شێوە کالسیۆم و ئاسن و سۆدیۆم و پۆتاسیۆم لەخۆ دەگرێت.

زەیتی زەیتوون بەراورد ناکرێت بە زەیتە دەستکردەکان، کە هەرسکردنیان قوورسە و زیان بە جەستە دەگەیەنن، بەڵکو زەیتی زەیتوون سوودێکی دەرئاسای بۆ جەستە هەیە. سوودەکانی لە وتن نایەن و لە تەوقی سەر تا بنی پێ سوودی هەیە. هەموو کەسێکی ئاقڵ و بەویژدان درک بەوە دەکات کە ئەم درەختە نەمرەی کە زەیتی لێ بەرهەم دەهێنرێت، تایبەت بونیاد نراوە بۆ مرۆڤایەتی.

ئەی باشە بەرهەمەکەی؟ پێویست دەکات سەبارەت بەوە قسە بکەین؟ ئەگەر سفرەوخوانمان بە زەیتوون نەڕازێنینەوە، ئەی بەچی بیڕازێنینەوە.

زەیتوون دوای لێکردنەوەی لە درەختەکان ڕاستەوخۆ ناخورێت. پێویستە بکرێتە سرکەوە و خۆش بکرێت. واتە پێویستە وەکو ترشیات بۆ ماوەی چەند مانگێک لە سرکەدا دابنرێت. ئەمەش چەند ڕێگەیەکی جیاوازی هەیە بۆ ئامادەکردنی و هەر ڕێگەیەکیش زەیتوونێکی بەلەزەتمان لەسەر خوانی بەیانی پێشکەش دەکات.



له جیهاندا خۆشترین جـۆری زەیتـوون کە لەسـەر سـفرەکان پێشکەش دەکرێت، لە وڵاتی ئێمەدا بەرهەم دەهێنرێت.

ئەو وڵاتانەشی زەیتوون بەرهەم دەهێنن، وەکـو ئـێمە بەردەوام لەسەر خوانی بەیانیان بەکاری ناهێنن.

لە سەفەرێکمدا بۆ ئیتاڵیـا ڕۆیشـتبووم و لە چـاوەڕوانی نـانی بەیانیدا بە خۆمم وت: ”ئۆه، ئێرەش مەملەکەتی زەیتوونە. کـێ دەزانێت دەبێت چەند جۆر زەیتوونمان پێشکەش بکەن.“ بەڵام دەتوانم بڵێم خەیاڵەکانم هەمووی بە بادا ڕۆیشتن. بەو کەسەی زەیتوونی سروشتیی بەرهەم هێنا دەڵێم: ”کارێکی باشت کرد.“

دەستخۆشییەکی تایبەتیش بۆ ئەو کەسەی زەیتوونی سـەوزی بە خۆشکراوی گژنیژ بەرهەم هێنا.

## "درەختی زەیتوون یەکەمی هەموو درەختەکانە"

مرۆڤەکـــان کەی ئەم بەرهەمە سەرســـوڕهێنەرەیان ئاشـــکرا کـــرد؟ لە ڕاســـتیدا ئەمە نەزانـــراوە، بـــۆیە یۆنـــانییە کۆنەکـــان دەڵـــێن ”olea prima omnium arborum est!“ بە واتای "درەختی زەیتوون یەکەمی هەموو درەختەکانە"

دەڵێن کـۆنترین زەیتـی زەیتـوون پـێش ٤٠٠٠ سـاڵ لە لایەن خەڵکانی سەر ڕووباری "ئیجە" لە ئەنادۆڵ بەرهەم هێنراوە.

## ئایا موعجیزەی سروشتە؟ بەدڵنیاییەوە!

ئەو کەسـانەی ڕیکـلام دەکەن، زۆر حەز بەوە دەکەن خەڵـک گەمژە بـکەن و گەورەتـرین مەرجـی کـارکردنی ئەو کەسـانەی ڕیکلام دەکەن؛ بریتییە لەوەی خەڵکی بەوە نەزانن!

چەند ساڵێک لەمەو پێش، بەرهەمهێنێکی زەیتی زەیتـوون بەم شێوەیە لە تەلەڤزیۆنەکاندا ڕیکلامی کرد:

ترنننن ترنننن! ئەمەیە زەیتی زەیتوون، موعجیزەیەکە بۆ خۆی! خۆتانی لێ بێبەش مەکەن! ئەمەیە دەرمانی هەزار دەرد.

هەرزانـی و ڕەسـەنێتییەکەی لای ئـێمەیە، خـۆ ئەمە زەیتـی کۆمپانیاکانی تر نییە گران بێ و باشیش نەبێ.

دوا قسـەمان ئەمەیە... ئەم زەیـتە مـوعجیزەیەکی سروشـتییە! ترنننن ترنننن!

- لێرەدا درکتان بەوە کرد چۆن ئێمەیـان بە گەمـژە لەقەڵەم دا؟ بەدڵنیاییەوە درکتان پێ کردووە!

وشەی موعجیزە؛ بە واتـای ئەوە دێـت شـتێک لە دەسـەڵاتی مرۆڤدا نەبێت و مرۆڤ بەرانبەری دەستەوەستان ببێت.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەم واتایە نەزانراوە و بۆ شتە ناسروشـتییەکان بەکار دێت، بۆ نموونە بە "شتە نادیار و ڕۆحانییەکان" دەوترێت "مـوعجیزە". ئەگەر وا بێـت کەواتە سروشـت دەرئاسـا نیـیە و دەرئاساش سروشت نییە.

ئێستا با کەمێک گفتوگۆ لەسەر دانەری ئەو ڕیکـلامە بکەیـن، بزانن چەند گاڵتەئامێز دەبێت:

- سڵاو هاوڕێکەم.

- سڵاو! ئایا کارتی ناونیشانی کەسییەکەم پێداون؟

- بۆستە، بۆسـتە! پەلە مەکە و دواتـر دەتـوانی کـارتەکەم پـێ بدەیت. با سەرەتا شـتێک لە تـۆ بپرسـم، ئایـا زەیتـی زەیتـوون موعجیزەیە؟

- بەدڵنیاییەوە موعجیزەیە، ئەی ڕیکلامەکەی ئێمەت نەدیووە؟ هی ئەو کۆمپانیایەی ئێمە لەوەش موعجیزەترە!

- باشە چۆن موعجیزەیەکە؟

- موعجیزەی سروشتییە.

- سروشتی؟

- بەڵێ مـوعجیزەی سروشـتییە! زەتـی زەیتـوون مـوعجیزەی سروشتییە! دوا قسەمان ئەمەیە... ترننن ترننن!

- بەڵام شـــتێک ئەگەر سروشـــتی بێـــت ئەوا سروشـــتییە. واتـــا مـــوعجیزە نیـــیە، دەرئاســـاش لەســـەروو سروشـــتەوەیە. واتا سروشتی نییە.

- چی؟

- باسی زەیتی زەیتـوون دەکەم، ئەگەر مـوعجیزە بێـت کەواتە سروشـتی نیـیە، ئەگەر سروشـتیش بێـت ئەوا مـوعجیزە نیـیە! ئێستا خۆتان یەکلا بکەنەوە، سروشتییە یاخود موعجیزەیە؟

- هینە... موعجیزەیە موعجیزە. بەو هەموو سوودەیەوە دەڵێی دەرمانە.

-ئێ کەواتە تۆ دەڵێیت سروشتی نییە؟

- با وا بڵێین.

-باشە ئەمە موعجیزەی کێیە؟

- هیـــنە... نـــازانم! ئەرێ هەر بەڕاســـت نـــازانم مەبەســـتت چیـــیە، چـــونکە پێشـــتر هەرگیـــز بەو شـــێوەیە بیـــرم لـــێ نەکردبووەوە. من تەنها دروستکەرێکی ڕیکلامم!

- باشـــتر نیـــیە بڵێـــی مـــوعجیزەی خـــودایە؟ لەبەر ئەوەی دەرئاساکان بەس خودا دروستی دەکات.

-ترنننن ترنننننن! زەیتـی زەیتـوون مـوعجیزەی خـودایە! ئەم قسەیەمان لێ وەربگرن!" بەم شێوەیە دەڵێیت؟

-ئەی بۆ نا؟ ئەوە ڕاستەکەیە.

- خۆ خراپیش نەبوو دەزانی؟
- بەدڵنیاییەوە زۆر باشتریش بوو!
- ترننننن ترنننننن! زەیتی زەیتوون موعجیزەی خودایە! ئەم قسەیەمان لێ وەربگرن!" ترننننن ترنننننن...

ئۆف لە دەست ئەو ڕیکلام دروستکەرانە! ئەگەر بابەتەکەمان زەیتی زەیتوون نەبوایە، بزانە چۆن دوو قسەم لەگەڵ ئەوانەشدا دەکرد کە ئاوی هەرچی میوەی خۆشە دەیگوشن و شەربەتی لێ دروست دەکەن. لەو لاشەوە دەڵێن: "سوپاسی سروشت دەکەین..."

## درەختی نەمر

درەختی زەیتوون لە مانگی نیسان و ئایاردا گوڵی سپی و مەیلەو سەوز دەردەکات و لە وەرزی زستانیشدا یەکێکە لەو درەختە جوانانەی گەڵاکانی دەوەرێت.

بەپێی تێپەڕبوونی کات شتەکان کۆن دەبن و ناشرین دەردەکەون، بەڵام درەختی زەیتوون بە پێچەوانەوە. چونکە درەختەکانی زەیتوون تا پیرتر بن جوانتر دەردەکەون و لەسەر زەویدا وەکو شوێنەوارێکی مێژوویی خۆیان نیشان دەدەن.

لەگەڵ ئەوەشدا درەختی زەیتوون درەختێکی ناسک نییە، ڕاستە حەزی لە ئاوە، بەڵام دەتوانێت لە بیابان و شوێنە کەم ئاوەکانیشدا گەورە ببێت.

هەر وەک چۆن دەتوانێت لە بوڕسا بژی بەهەمان شێوە لە فەڵەستینیش دەژی.

یاخود شاری قودسی پیرۆز کە لە دوعاکانماندا یادی دەکەینەوە و دەکەوێتە سەر دەریای ناوەڕاست، درەختی زەیتوونەکانی هەزار ساڵ دەبن و بەشێک لە مێژووی ئەو شارەی لەسەر نووسراوەتەوە.

یان ڕەنگە تاکو ئێستاش ئەو درەختە زەیتوونانە مابێت، کە پێغەمبەران لە ژێر سێبەرەکانیدا دانیشتبوون.

درەختی زەیتوون وەکو درەختی میوەکانی تر پێویستی بە چارەسەری کیمیایی نییە بۆ باڵندە و گورگ و مێرووەکان. هەر خۆیان حەزیان بەو چارەسەرە کیمیاییانە نییە.

درەختێکی زەیتوون، بۆ ماوەی سەد ساڵ یاخود هەزار ساڵ دەژی و بەردەوامیش میوە بەرهەم دەهێنێت. لەبەر ئەوەشە پێی دەڵێن "درەختی نەمر". بەڵام بەدڵنیاییەوە درەختی زەیتوون هیچی پێ ناکرێت بەرانبەر ئاگرکەوتنەوە، یاخود بڕینەوەیان لەلایەن داربڕەکانەوە. بۆیە پێویستە ئێمە تا لە تواناماندا هەبێت، ئەو درەختە بپارێزین...

# ئایەتەکانی زەیتوون

سەردەمی سەربازیم لە وێستگەیەك بەسەر بەرد پەرژینەکەی داری زەیتوون بوو، لەوێ ناوە ناوە دەچووومە ناو ناوچەی دار زەیتوونەکانەوە و تێیدا دەگەڕام. یەکەم چاوپێکەوتنم لەگەڵ دار زەیتوونەکان لە نزیکەوە بەم شێوەیە بوو.

پێشتریش دووراودوور خۆشم دەویست، بەڵام کاتێک لە نزیکەوە ناسیم، زیاتر هۆگری بووم و خۆشەویستییەکەم زیاتر بوو.

درەختە بەتەمەنەکانی زەیتوون وەکو پەیکەرێک وان، بڕوانە ئەو ڕاوەستانە سەرنجڕاکێشەیان، ئەو گەڵایانەی لەبەر ڕووناکی شەودا ڕەنگیان زیوییە و لە ڕۆژیشدا دەدرەوشێنەوە! ئەو تووێکڵە تایبەتەی ڕووی قەدەکانی داپۆشیووە، ئەو سێبەرە فێنکە و دەنگی ئەو ڕەشەبایەی بە نێوان قەد و گەڵاکاندا دەڕوات.

مرۆڤ پێویستە سوپاسی ئەو بەدیهێنەرە بکات کەوا درەختی زەیتوونی دروست کردووە، بەرانبەر ئەو بەرە بەرەکەتدارەی پەلەکانی دەڕازێنێتەوە شایەنی سوپاسکردنە.

لە چاوی مندا، خودای گەورە لە ئایەتەکانی قورئانی پیـرۆزدا باسی قەدەکان و گەڵاکان و ڕەگ و گەردەکانی کردووە.

زەیتـــوونیش هەر وەک هەنجیـــر لە ســـوورەتی "التـــین" دا ســـوێندی پــێ خـــوراوە، یــاخود لە ســـوورەتی "النحــل" دا لە ئایەتەکانیدا ئاماژەی پێ کراوە.

" خــودا بەو ئــاوە کشــتوکاڵ و زەیتــوون و خورمــا و تــرێ و هەموو بەرێکتان بۆ سەوز دەکات. بەڕاستی ئایەت و نیشــانەی دەســتەڵاتی خــودا لەم ســەوزکردنەدا هەیە بــۆ قەومــێ کە بیــر بکەنەوە و عەقڵیان بخەنە کار." (النحل: ١١)



# ئەو کانییانەی ڕووە و سەرەوە هەڵدەقوڵێن



یەکێک لە کابووسەکان کە تووشی دانیشتوانی نیشتەجێی شوقە دەبێت، ئەوەیە دراوسێکەی قاتی خوارەوەی بێت و پێی بڵێت: " لە ماڵەکەمدا ئەو شوێنەی بانیۆکەی ئێوەی لە ژێرە، ئاو دادەدات."

لە زووترین کاتدا پێویستە وەستایەکی ئاوەڕۆ بدۆزنەوە و ئەو شوێنەی ئاوەکەی لێ دەچێت؛ چاکی بکەنەوە. لە هەمان کاتدا ئەوە ئیشێکی زۆر گران و ئەستەمە.

ڕەنگە ئەو وەستایە بەپێی پێویست لە کارەکەدا ڕاستگۆ و شارەزا نەبێت! ئەو هەمووە گەڕان تا دۆزیتانەوە و دواتر بە هەزار بەساقە و بەقوربان داواتان لێ کرد تا لە کاتی خۆیدا ئامادە بێت.

-چی بوو وەستا عوسمان؟ هێشتا شوێنی لێچوونەکەت نەدۆزییەوە؟

- بـــراکەم، بە بـــڕوای مـــن لەو ســـووچەدا کێشـــەیەکی زۆر گەورە هەیە.

- واتا؟

- واتا با ئەو سووچەش بشکێنین و سەیری بکەین.

- لە بانیۆکەدا کاشـی نەمـاوە نەیشـکێنیت، هـیج برغـوویەک نەماوە نەیکەیتەوە، تەنانەت دۆڵابەکەشت لە شوێنەکەی خۆیدا لابردووە! ماڵ و منداڵم لە کاتی پێویستیدا دەبێـت بچـنە مـاڵی دراوسێکەی تەنیشتمان.

کوڕە بچووکەکەیان ئەمەی لەسەر دەرگاکەیـان هەڵواسـیوە: "گەورە بە هەزارە و بچووک بە ٥٠٠ دینارە."

- باشـــە کـــاکە، لە مـــزگەوتەکە هەردووکیـــان بە هەزار دینـــارە! نـــا دادپەروەرانەیە! گەورە و بچـــووک وەک یەک وایە؟ نەخێر بەدڵنیاییەوە.

- وەســتا عوســمان ئەوە گــاڵتە دەکەی؟ خێـرا ئەو دەرچەیە بیدۆزەرەوە؛ لەو کێشەیە ڕزگارم کەن!

- ئـــای بـــراکەم! تـــۆ بەڕاســـتی نووســـەری، هەر بە پێـــوە هۆنراوەیەکت وت!

- تێنەگەیشتم؟

- ئەو دەرچەیە بدۆزەرەوە، لەو کێشەیە ڕزگارم کە! براکەم ئەمە دروشـــمە، مـــن ئەم ڕســـتەیە دەکەمە ســـەر کـــارتی ناونیشـــانی کەسییەکەم!

"وەستا عوسمان، پسپۆڕی سەلامەتی ئاو و ئاوەڕۆکانتان."
- دەزانیت خەریکە ئیتر پێم نامێنێت!
-براکەم ئاوەکە لێی دەچێت من چی بکەم، ئاوەکە دەڕوات!
-هەستە بڕۆ! بڕۆ...

ئاو دەڕوات بەڵێ! ڕێگەیەکی دۆزیـوەتەوە و دەڕوات. ئەگەر دانیشتووی شوقەیەک بن، یەکێک لە کابووسەکان ئەوەیە ئاو لە شوێنێک بچێت و بڕوات و بگاتە ماڵەکەی نهۆمی خوارەوە.

کابووسی ڕاستەقینە ئەوە نییە دراوسـێکەی نهـۆمی خـوارەوە بێزارت بکات، بەڵکو ئەوەیە دراوسـێکەی نهـۆمی سـەرەوەتان بێت و پێتان بڵێت: " لە ماڵەکەمدا ئەو شوێنەی بانیۆکەی ئێوەی لە سەرە؛ ئاو سەر دەخات." چونکە ئەوە تەنهـا لە خەونەکانـدا ڕوو دەدات.

بەڵام بەدڵنیـــاییەوە، ئەگەر لە هەســـارەیەک بـــژین هێـــزی کێشکردنی نەبێت؛ بابەتەکە جیاوازە!

## ئەو ڕووبارانەی دەڕۆن بەرەو سەرەوە

کاتێــک دەمانەوێــت لێــدوانێک بــدەین دەربــارەی ئەوەی نەمانەوێــت کارێـک بکەیـن، یـاخود توانـای کـردنیمان نیـیە، هەمیشە نموونەی مەحاڵ دەهێنینەوە و دەمانەوێـت تێمانـبگەن لەسەر بڕیارەکەمان چەند سوورین.

هەر وەک چۆن لەم هۆنراوەیەدا هاتووە:

"ئەگەر ڕووبارەکانی ئۆرد و بەسەر شاخەکاندا

سەر بکەون،

ئەگەر سوپایەك بێت و دژم بوەستێت،

من دەستبەرداری تۆ نابم."



ئەم شیعرە بۆ کێ وتراوە نازانم، کێش یەکەم کەس وتوویەتی هەر نازانم.

بەڵام کاتێک دەڵێت: " دەستبەرداری تۆ نابم" دیارە بۆ کەسێکی خۆشەویستی وتووە؛ ئاوا سوورە لەسەری و نموونەی مەحاڵی هێناوەتەوە.

- ئەگەر ڕووبارەکان بەرەو سەرەوەش بڕۆن!

هەر بـۆیە کاتێـک لێـدوانێک دەدەیـن دەربـارەی شـتێک کە ناتوانین بـیکەین، ئەوا بە نمـوونەی مەحـاڵ ڕەتـی دەکەیـنەوە. چونکە زۆر مەحاڵە ڕووبارەکان بتوانن بەرەو سەرەوە بڕۆن!

ئـاو هەمـوو کاتێـک لە سـەرەوە بەرەو خـوارەوە دەڕژێـت، ئەگەرچی تاڤگە یان نافورەش بێت.

واتا کاتێک پەرداخێک لەسەر مێزێک بەردەبێـتەوە، زەویـیەکە تەڕ دەبێت، نەک بنمیچەکە!

ئەگەر ئاو لە سەرەوە بۆ خوارەوە نەڕژایە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە خوارەوە بۆ سەرەوە بڕژایە، ئەو کاتە کۆمەڵێـک کێشـەتان بـۆ دروسـت دەبـوو و لیسـتی پێداویستیەکانیشـتان دەگـۆڕا. بـۆ نمـوونە؛ ئەگەر بتانەوێـت ئاوێـک لە بنـی بیرێکـدا دەربـکەن، پێویستان بە گوریس و سەتڵێک دەبێت. بەدڵنیاییەوە بـۆ ئەوەی بەئاسـانی سـەتڵە پـڕ ئـاوەکە بەرز بـکەنەوە، ئەوا پێویسـتان بە سیستمێکی بەرزکەرەوەش دەبێت.

لە ڕاستیدا ئاو دەرهێنان لە بنی زەویدا کارێک بووە مرۆڤەکـان لە دێر زەمانەوە پێوەی سەرقاڵ بـوون . واتـا کـارێکی ئەوەنـدە ئاسان نەبووە، بەتایبەت بابەتی ژیان و مردن بووە.

هەر بۆیە بە درێژایی مێژوو مرۆڤەکـان ناچـار بـوون نوێـڵ و مزەخە و چەندەها ئامێری تر دابهێنن.

- ئەی باشـە خـواردنەوەی ئـاو لە بتڵێکـدا بە قەسـەب هەر هەمان شتە؟

-بەدڵنیاییەوە، ئەی زیرەک!

ئەم زەوییە شینە جوانەی ملیۆنەها زیندەوەری لەخۆ گرتـووە، ئەگەر ساڵ دوانزە مانگ بارانیشی بەسەردا ببارێت، هەر ناچارە لە ژێر گڵ و لە بنی زەوییەوە ئاو بەرەو سەرەوە ڕەوانە بکات.

- بەڵێ، مەبەستم درەختەکانە.

درەختیش وەکو هەموو ڕووەکێکی تر بۆ ئەوەی بژی، ئـاو لە بنی زەوییەوە بە سیستمی خۆی بەرز دەکاتەوە بەرەو لقەکـانی، تا دەگاتە بەرزترین گەڵای سەر درەختەکە...

هەر وەک چۆن مەحاڵە ڕووباری ئۆردۆ ئاوەکەی لە خـوارەوە بـۆ سـەرەوە بـڕوات، بە هەمـان شـێوە مەحـاڵە ئـاو بە ڕەگـی درەختێکـدا تـا گەڵاکـانی سـەر بکەوێـت، مەحـاڵە بەڵام ڕوو دەدات! لە ڕاستیدا لەم هەسارەیەدا زۆر شـتی مەحـاڵ هەیە کە ڕوو دەدات.

بۆ نموونە، چۆلەکەکان دەفڕن، هەنگەکان هەنگوین دروسـت دەکەن، گوڵەکـان بۆنوبەرامەیـان هەمـوو لایەکـی تەنیـووە و هەورەکانیش بە سەرماندا دێن و دەڕۆن.

کۆرپەلەکـان دێـنە دنیـاوە و جـوجەڵەی بچـووك بچـووك هێلکەکان دەتروکێنن و دێنە دنیاوە. لە سنگی دایکەکانـدا شـیر دروست دەکرێت و منداڵەکانیش تامەزرۆی ئەو شیرە دەبن..



ئەو هەموو لوولەیەی لە قەدی درەختەکاندایە و تۆڕێکیان دروست کردووە بۆ گەیاندنی ئاو لە ڕەگی درەختەکەوە تا پەلەکانی سەرەوە، بە پرۆسەیەك هێندە ئاڵۆزە بە مێشکی مرۆڤەکاندا نایەت.

لەم دنیایەدا زۆر شت هەیە بەلای ئێمەوە مەحاڵە، بەڵام ڕوو دەدات!

لە ڕاستیدا وای لێ دەکەن ڕوو بدات، ئەوەی لەسەر ئێمەیە ئەوەیە لە شێوازی ڕوودانەکەی تێبگەین.

ئاخۆ ئەم درەختانە بە چ سیستمێك بە درێژایی ملیۆنەها ساڵ ئاو لەژێر زەوییەوە بەرز دەکەنەوە؟ لە کاتێکدا لە چاخی بەردینەوە تا ئێستا، مرۆڤەکان بە بەکارهێنانی هەموو ژیرییانەوە هەوڵیان داوە تا چەند ڕێگەیەك بۆ سەرخستنی ئاو بدۆزنەوە.

ئـاخۆ دەبێـت نوێـڵ لەنـاو قەدی ئەسـتووری درەختەکانـدا هەبێت؟ یاخود ترومپای ئاو کە توانای بینینـیمان نەبێـت، یـان ڕەنگە مزەخەیەك کە توانای بیستنیمان نەبێت؟

## بۆرییەکانی ئاو و ئاوەڕۆ گرنگن

ئەگەر بـابەتەکە هەڵگـرتن یـاخود گواسـتنەوەی ئـاو بێـت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، ئەوا پێویسـتتان بە سـەتڵێکە ئـاوی لێنەچێـت، یـاخود بـۆری ئـاو دابنـێن و لە ناویـدا سیسـتمی هاتوچۆپێکردنی ئاو هەبێـت، بە مەرجێـک بۆرییەکـان توانـای هەڵگرتنی ئاوەکەیان هەبێت. ئاو تەنها بەو شێوانە دەگوازرێتەوە یاخود هەڵدەگیرێت. بۆیە دامەزراندنی بۆری ئاو گرنگە!

گرنگ نییە درێژیی درەختێك چەند بێت، ئەگەر بستێک بێت، یاخود ١٢٠ مەتر جیاوازی نییە، چونکە سیستمی گواستنەوەی ئاو لە درەختەکاندا بە شێوەیەکە ئاو بە ڕەگەکاندا سەر دەکەوێت و بە لق و پەلەکاندا ڕەوانە دەکرێت؛ تا دەگاتە گەڵاکان.

ئەم سیستمە لە چەند ڕێچـکەیەك پێـک دێـت، کە لە ژمـاردن نایەن و زۆر ورد و بچووکن، تەنانەت لە تاڵی قژیش باریکترن. دەزانن ئەم بۆریچکانە چۆن دروست بوون؟ خانە ڕووەکییەکان گەشـــەیان کـــردووە تـــا بە تەواوی گەورە بـــوون و ئیـــتر سایتۆپلازمەکەی ناویان وشکی کـردووە و مـردوون. ئەم خـانە مـردووانە وەك هەمـوو خـانە ڕووەکییەکـانی دیـکە بەرگێکـی

ئەستووریان هەیە پێی دەوترێت (سلیلۆز). یەکگرتنی چەندین خانەی مردووی ناو بۆشی لەم جۆرە، بووەتە بۆریچکە و بۆریچکەکانیشی یەکیان گرتووە تا تۆڕێکی بەهێزی گواستنەوەی ئاو دروست بکەن، کە پێی دەوترێت دارك (xylem) کە ئاو دەگوازێتەوە لە ڕەگەکانەوە بۆ گەڵاکان.



## ڕۆژی دە سووراحی ئاو

لە ڕۆژە گەرمەکانی هاویندا درەختێک نزیکەی ٢٠٠ لیتر ئاو لەدەست دەدات، بەپێی بە قەبارەی درەختەکە. هەر ٢٠ لیترێک ١٠ دۆلکە ئاو دەکات! پێویستە ئەو ئاوەی لە دەستی دەدات؛ دووبارە بەردەستی بخاتەوە.

لە بەشی خوارەوەی گەڵاکاندا، کونیلەی بچووك هەیە پێیان دەوترێت؛ دەمیلە (Stoma) لەم دەمیلانەوە ئاو لە ڕێگەی بەهەڵمبوون دەچێتە دەرەوە.

هەر بۆیە ئەو سیستمی گواستنەوەی ئاوی ناو درەختەکان گرنگە، چونکە ڕێگە دەدرێت لە وشکبوونەوەی گەڵاکان و بەردەوام لە جووڵەپێکردنی ئاودایە.



کاتێک ئاو لە دەمیلەکانەوە دەبێت بە هەڵم، ئاوی نوێ لە ڕەگەکانەوە بە ڕێگەی دەمارەکان دەگاتە دارك و و دواتریش دەگاتە دەماری گەڵاکان و ئاوی نوێ وەردەگرن.

گەردیلەکانی ئاو دەستی یەکیان گرتووە تا ئەم گەشتە تەواو دەکەن. ئەگەر ئەو دوورییەی هەر گەردیلەیەك دەیبڕێ هەژمار بکەین، دەکاتە بڕینی ملیۆنەها کیلۆمەتر، چونکە تا ئەم گەردیلانە لە پرۆسە دەرئاساکەی ڕۆشنەپێکهاتندا بەنێو

گەڵاکاندا بڵاو دەبنەوە و دەبنە هەڵم، دەبێـت گەردیـلەی نـویێ گەشـتبێتەوە گەڵاکە؛ ئەویـش بە بڕینـی ڕێـگەیەك لە قـووڵایی خاکەکەوە.

کاتێک ئاو لە گەڵا ئاوریشـمییەکانەوە کەم دەکـات، دەرگـای خانە زۆر وردەکان بە ڕووی گەردیلەکانی ئاودا دەکرێنەوە.

دوای ئەوەی خانەکان تێر ئاو بوون، دەرگاکانیان دادەخرێت. چیتر ئاو هەڵنامژن تا ئەو کاتەی پێویسـتیان دەبێـت، بەڵام ئەمە زۆر ناخایەنێـت. کاتێـک بـایەکی گەرم هەڵـدەکات و تیشـکە بەتینەکانی خۆر دەیدات لە گەڵای درەختەکـان، ئەو کـاتە ئـاو دەبێت بە هەڵم و هاوکێشەکە دووبارە دەبێتەوە.

ئەو بـۆرییە وردانەی وەک تـاڵی قـژ وان، دووبـارە تۆڕێـک دروست دەکەنەوە و گەردەکانیش یەک دەگرنەوە و بە گوێنەدانە هێـزی کێشـکردن، دەسـت دەکەن بە بەرزکـردنەوەی ئـاو لە خوارەوە.

## پێش پسوولەکە

۲۰۰ سـاڵ لەمەوپـێش، چەنـد زانـایەکی شـارەزای دار و درەخت شتێکی نامۆیان دۆزییەوە، کە ئاو لە ڕەگـی درەختـەوە بەرەو لق و گەڵای درەختەکان دەڕوات بەبێ گوێدان بە هێـزی کێشکردنی زەوی، بەڵام نەیانتوانی هۆکارەکەی ڕوون بکەنەوە.

ڕەنگە بڵێین بەراورد بە ۲۰۰ساڵی پێشوو چی گۆڕاوە؟



لە ڕاستیدا هیچ شتێک نەگۆڕاوە، تەنها ئەوە نەبێت زاناکان لەسەر چۆنییەتی کارکردنی ئەو سیستەمە چەند زانیارییەکیان دۆزیوەتەوە، بەڵام نەیانتوانیوە زانیاریی تەواوەتی بخەنە ڕوو.

کاتێکیش زانیاریی زیاتر فێر دەبین، ئەو کاتە لەوە تێدەگەین مەحاڵە و باوەڕپێکراو نییە؛ کە وا ئەم سیستەمە بە ڕێکەوت و هەر لەخۆوە ملیۆنەها ساڵ لەمەوپێش بونیاد نرابێت. هەر وەک چۆن هەندێک لە خەڵکی بیری لێ دەکەنەوە.

چونکە گواستنەوەی ئاو بۆ قەدەی درەختەکان بە سیستمێکی تایبەت بونیاد نراوە، ناکرێت هەر لەخۆوە دروست بووبێت.

هەر وەک چۆن کاتێک ئاوی پاک بۆ ماڵان دابین دەکرێت؛ پێویستی بە بۆریەکە لە دووری چەندەها کیلۆمەترەوە کۆڵان بە کۆڵان، شەقام بە شەقام، ماڵ بە ماڵ ببڕێت تا دەگاتە

ماڵەکانتان، خۆ ناکرێت بڵێین ئەمە بە ڕێکەوت ڕووی داوە و کەس دەستی لەم کارەدا نەبووە، چونکە ئەمە ملیار جار کەڕەتی ملیار، ئینجا کەڕەتی ملیارێکی تریش باس بکرێت کە لە خۆوە ڕوویداوە، ناچێ بە مێشکی کەسدا.

بەڵام کاتێک مرۆڤ ویستی بڕوا بە شتێک بکات، ئەو شتە چەند لەدەرەوەی مێشکی مرۆڤیشدا بێت؛ هیچ گرنگیی نییە.

بەدڵنیاییەوە، ئەو کاتەی پسووڵەی ئاوەکەیان دێتە بەردەم، کارەکە جۆرێکی ترە!

- ئەمە چییە؟

- پسووڵە! پسووڵەی بەکارهێنانی ئاو!

- پسووڵەی چی براکەم. من ڕۆژێک بە ڕاست و چەپدا ئەم بەلووعەیەم بادا و لە ناکاو ئاو دەرچوو. چی پەیوەندییەکی هەیە بە ئێوەوە؟ ئەوە بە تەواوەتی ڕێکەوتی سروشتییە! هەر خۆی لەخۆوە دروست بووە. واتا بە ڕێکەوت دروست بووە! من پارەی پسووڵە نادەم!

- جارێ با واز لە باسی ئەم ڕێکەوت و شتە بهێنین، تۆ ئەو بەلووعە بسووڕێنەرەوە بۆ ماوەی چەند ملیۆن ساڵێکی تر، بەڵکو سروشت دووبارە چانسێکی نوێت پێ بداتەوە، پێت چۆنە؟ دەکرێت؟

- براکەم، داشکاندنم بۆ دەکەن؟



# خەیاڵ نییە ڕاستییە: درەختی نەستەلە



لەسەر مێزەکەم پاکەتێک نەستەلەی لێیە، ڕێک بەرانبەرم دانراوە. ئەم دێڕانە بە تەماشاکردنی ئەو دەنووسم. لە ڕاستیدا نامەوێت تەماشای بکەم، بەڵام ناکرێت. چاوم بەردەوام دەچێتە سەر پاکەتە نەستەلەکە. نەستەلەکەی ڕەشە؛ (٨٥%)ی لە کاکاو پێکهاتووە!

ئەوەی لەبەری مردووم ئەوەیە دەڵێی خەڵووزی ڕەشە، کەچی مرۆڤ بە خواردنی دەگاتە ئاسودەیی ڕۆح و دەڵێت: " ئیتر ئێستا ئاسودە بووم."

پێکهاتەی نەستەلەیەك بۆ ئەوەی ببێتە نەستەلە، بریتییە لە کاکاو. بۆ ئێوە وا دەزانن ئەو بەرهەمانەی لە بازاڕدا دەفرۆشرێت نەستەلەیە؟ " بە ڕێژەیەکی زۆر کاکاو"ە.

لە ڕاستیدا ئەو نەستەلانە کاکاو پێکهاتە سەرەکییەکەیانە، ناچنە ڕیزی ئەو نەستەلە شیرینانەی لە دەنکۆڵە شەکرەکان پێک هاتووە. ئەو نەستەلەیەش (٨٥%)ی کاکاوە؛ ئەوە کاکاوە.

نەخێر بەڕێزم! ئاوا نابێت! باشترین شت ئەوەیە قـاوەیەک بـۆ خۆم دروست بکەم. بە نووسینی ئەو بەرگ و ڕێژەیە تێمەکەوە، گرنگ ئەوەیە دەممان شیرین بکەین!

## درەختی نەستەلە

بۆ ئەو کەسەی وا دەزانێت پەتاتە وەك مەعکەرۆنی لە هەویـر دروست دەکرێـت، ئەسـتەمە بتوانێـت بـاوەڕ بکـات نەسـتەلە درەختی هەیە!

-ئەو مرۆڤە سەیروسەمەرەیە کێیە؟

-ئێێێێێێێێ.... هین.... هاوڕێیەکە ئیتر خۆ قابیلە کێیە؟

ئەو کاتە زۆر منداڵ بوو، یەکەم جاری بوو ببینێـت پەتـاتەیەك لە گڵەوە سەر دەردێنێت....

واز لەوە بهێنە، هەر بەڕاستی درەختی نەسـتەلە بـوونی هەیە؟ ئەگەر وایە با لە باخچەکەی پشتەوە بیڕوێنین.

-ها ها ها! تۆ جارێ کەسێکم پێ بناسێنە باخچەی پشـتەوەی هەبێت، مـن هەرچییـەکم کردبێـت درەختێکـی نەسـتەلەی بـۆ دەدۆزمەوە. باخچەی پشتەوە، پف! یەکێ نەزانێت ئـێمە وەکـو فیلمە ئەمریکییەکان خـانووی زۆر زەبەلاحـمان هەیە و بەدوای درەختی نەستەلەدا دەگەڕێین بـۆ بـاخچەی پشـتەوەمان. ئەگەر باخچەی پشتەوەم هەبوایە، ئەو کاتە چیمەنەکەیم جـوان چـاک دەکرد و دواتر دەمدا بە بەڵێندەرێکی خانووبەرە!

- ئەی ئەوە نییە باخچەی پشتەوەمان درەختە قەزەمێکی لیمۆی لێیە وشکی کردووە و شۆڕ بووەتەوە؟

- قەینا درەختی لیمۆ دەبێت!

بەدڵنیاییەوە لەسەر زەوی درەختێکی نەستەلە بوونی نییە کە بە لقەکانییەوە دەنکۆڵەی شوکولاتەی پێوە بێت.

واتا ئەگەر دوای گریانێکی زۆر بۆ پاکەتێک نەستەلە پێتان وترا: "تۆ بە چی تێگەیشتویت، وا دەزانی درەختی نەستەلە لە چێشتخانەکەدا هەیە؟" ئەوە زۆر ئاساییە.

چونکە هەر وەک چۆن ئەو درەختە لە چێشتخانەکەی ئێوەدا نییە، بە هەمان شێوە لە باخچەی ئەو ماڵانەشدا بوونی نییە کە باخچەیان هەیە. نەستەلە تەنها یەک درەختی هەیە، ئەویش درەختی کاکاوە!

## درەختی کاکاو

درەختی کاکاو ڕووەکێکی گەرمەسێرییە، لە کەشێکی گەرم و شێداردا گەشە دەکا. درەختێکی تەمەن درێژە، دەوترێت بۆ ماوەی ٢٠٠ ساڵ دەتوانێت بژی. بەڵام ٢٥-٣٠ ساڵی پێ دەچێت تا بەرهەمەکەی پێدەگات بۆ دروستکردنی کاکاو.

ئەو شوێنانەی درەختی کاکاو بەرهەم دەهێنن، بریتین لە: ئەندۆنیسیا، سریلانکا، ماداگاسکار(جەزیرەیەکە لەسەر دەریای هیندی) غانا، ڕۆژئاوای ئەفریقا، ئەمازۆن، بەڕازیل، ناوەڕاست و باشووری ئەمریکا.

ڕۆژئاوای ئەفریقا یەکەم وڵاتە لە بەرهەمهێنانی کاکاودا.
لە (٣٣ %)ی هەمـــوو کاکـــاو لێـــرەوە بەرهەم دەهێنرێـــت. بەڵام وڵاتـــی دایـــک بـــۆ نەســـتەلە بـــریتییە لە باشـــووری ئەمریکـــا، چـــونکە ٤٠٠٠ ســـاڵ لەمەوپـــێش خەڵکـــی ئـــازتەك و مایـــــا و ئـــــۆلمێکس؛ یەکەم کەس بـــــوون لەنـــــاو بەری درەختـــــی کاکـــــاودا کاکاویـــــان دەرکـــــرد ، بەڵام دوای ئەوەی باشـــووری ئەمریکـــا داگیـــر کـــرا و خـــرایە ســـەر ئەوروپـــا، ئەو کـــاتە زۆربەی خەڵـــکەکەی مـــردن و خەڵـــکە ڕەســـەنەکانیان لەدەست دا.

وشـــەی نەســـتەلە لە بنەڕەتـــدا بە ئـــازتەکی پێـــی وتـــراوە شـــۆکۆئاتڵ (xocoatl). وشـــەی شـــۆکۆئاتڵ لە ئەنجـــامی یەکگرتنـــی وشـــەی ئـــاو و تـــاڵ دروســـت بـــووە، بە کـــورتی بە واتای ئاوی تاڵ دێت!

- باشە ئەی بۆچی بە نەستەلەیان وتووە ئاوی تاڵ؟

ئەگەر وەکو من نەستەلەیەکتان خواردبێت ڕێژەی کاکاوەکەی زۆر بوو بێت، ئەو کاتە لە هۆکارەکەی دڵنیا دەبنەوە.

هەم کاکـــاویش وەکـــو ئەوە شـــیرین نیـــیە کە پێشـــبینی دەکەیـــن. ڕەنـــگە بـــۆنێکی ســـەیری هەبـــوو بێـــت، بەڵام بەدڵنیاییەوە شیرین نەبووە.



(نزیکی ٤٠٠٠ ساڵ لەمەوپێش، یەکەم دۆزینەوەی کاکاو لە درەختی کاکاودا بەردەستیان خست، بریتی بوون لە خەڵکانی ئەمریکای باشوور؛ کە لە شارەکانی ئازتێکس و مایا و ئۆڵمێکس بوون. ئەم ڕووەکە لە درەختی کاکاو دەردەهێندرێت و دواتر وشک دەکرێت؛ بە چەند قۆناغێک ورد دەکرێت و دەهاڕدرێت. بەم شێوەیەش کەرەی کاکاو و کاکاوی هاڕاو دروست دەکرێت).

شوکولاتە یاخود ڕاستر بڵێین شۆکۆئاتڵ، سەرەتا کە دۆزرایەوە وەکو خواردن نەبوو، بەڵکو وەکو خواردنەوە بوو. جگە لەوەش خواردنەوەیەک نەبوو منداڵان حەزی لێ بکەن. خواردنەوەیەکی تا بڵێی تاڵ و توون بوو و چەندین بەهاراتی تێکەڵ دەکرا.

ئەم خواردنەوەیە تەنها لەلایەن چینی ئۆستۆکراتی و خاوەن دەسەڵاتەکانەوە دەخورایەوە؛ لە مەراسیمی ڕەسمی و بەخاکسپاردن و ئاهانگەکاندا. بەتایبەت پاشاکانی ئازتەك زۆر خولیای کاکاو بوون، تەنانەت کۆشکەکانیان پڕ کردبوو لە درەختی کاکاو.



خەڵکانی مایا باوەڕیان وابوو نەستەلە مرۆڤ دڵخۆش و ئاسودە دەکات. لە ڕاستیدا لەمەیاندا کێشەمان نییە، چونکە لەناو کاکاودا چەند ماددەیەک هەیە یارمەتی دەردانی سیرۆتۆنین(هۆرمۆنی دڵخۆشی) دەدات لە مێشکماندا، ئەمەش بەرپرسە لەوەی مرۆڤ هەست بەباشی بکات؛ بە واتا خواردنی کاکاو لە ڕاستیدا پەیوەندی بە دڵخۆشی مرۆڤەوە هەیە.

بەڵام خەڵکی مایا زیادەڕۆییان لەو بابەتەدا کرد و هاتن "خودای نەستەلە"یان دروست کرد و دەستیان کرد بە پەرستنی. بەڵام ئەم کارەیان ئەنجامەکەی کارەسات بوو، چونکە لە وەرزی هاویندا پەیکەری نەستەلەکەیان توایەوە و ئەمەش هیچ باش نەبوو بۆ خەڵکەکە.

# چیرۆکێکی کورت سەبارەت بە نەستەلەی تاڵ و شیرین

دەریاوانەکانی ئیسپانیا دوای داگیرکردنی ئەمریکای باشوور، یەکەم شت کە بەدوایدا دەگەڕان؛ ئاڵتوون بوو. بۆ دۆزینەوەی ئاڵتوون هەموو کارێکیان بەرانبەر خەڵکەکە دەکرد، تەنانەت شمشێریان لەسەر ملیان دادەنا. ئازتەك و مایایان لە ڕەگەوە دەرکرد؛ مێژوو ئەو دڕندەییەی بە خۆیەوە نەدیبوو.

ئەورووپاش لەو کاتەدا گەیشت بە خواردنەوە تاڵ و دەنکۆڵەی کاکاوی مایا. خەڵکی ناوخۆ زۆر گرنگیان بە دەنکۆڵەی کاکاو دەدا و بەدڵنیاییەوە بازرگانە گەورەکانی خواردنیش سەرنجی ئەمەیان دابوو. لە سەرەتادا خەڵکی لەگەڵ میواندا ئەو خواردنەوەیەیان دەخواردەوە، بە بیانووی ئەوەی "میوان لە ڕێگەیەکی دوورەوە هاتووە" لە کاتێکدا حەزیان پێی نەدەکرد. بەڵام دوای ماوەیەکی کەم هەستان بە تێکردنی شەکر بۆ ناو خواردنەوەکە. کاتێک بابەتەکە دێتە سەر خواردن، قۆڵبڕین، لەناوبردن، دزین، لێدان و پەکخستنی موڵکی خەڵکی؛ ئەوا مێشکی ڕۆژئاواییەکان زۆر بەباشی کار دەکات.

داگیرکەرەکان و دۆمەنیکییەکان، کاتێک لە ئەمریکای باشوور گەڕانەوە بۆ ئیسپانیا، لەگەڵ خۆیاندا هەم خواردنەوەی کاکاو و هەمیش ڕێژەیەکی زۆریان لە دەنکۆڵەی کاکاو لەگەڵ خۆیاندا بردەوە.

بەم شێوەیە ئەورووپا نەستەلەی ناسی. بەڵام نەستەلە هەتا ساڵی ١٧٠٠'ەکان هەر بە شێوەی خواردنەوە بەکار دەهات، ئەگەر چی شیرینیش دەکرا.

لە ساڵەکانی ١٧٣٠ دا کیمیازانێکی هۆڵەندی ئامێری "پەستێنەری کاکاو" ی داهێنا و بەم جۆرە لە جیاکردنەوەی زەیتی کاکاو سەرکەوتوو بوو. ئەمەش ڕێگەخۆشکەر بوو بۆ گەیشتنی ئاستی نەستەلە بەم قۆناغەی ئەمڕۆ.

لە دوای چەند ساڵێک، پیاوێکی سویسریی بەهەڵپە، ڕێگەیەکی دۆزییەوە بۆ تێکەڵکردنی شیر و نەستەلە. بەم شێوەیە نەستەلەی بە شیر دروست کرد.

دوای ماوەیەکی کەم نەستەلە لە پلەیەکی گەرمی دیاریکراودا دەتوێنرایەوە و لە ناو شووشەی دوکانی نەستەلەکاندا پێشکەش دەکرا.

لەمڕۆدا، ڕۆژئاوای ئەفریقا یەکەمە لە بەرهەمهێنانی درەختی کاکاو لە جیهاندا و ٣٠ ٪ی کاکاو لە جیهاندا دابین دەکات؛ بە کارکردنی ڕۆژان و شەوانەی خەڵکی ناوخۆ، لە شوێنە گەرم و شێدارەکانی گەورەکردنی درەختی کاکاودا. بەڵام ئەو بەشانەی دیکەی زەوی کە نەبوونەتە نیشتیمانی کاکاو و تێیاندا بەرهەم نایەت، ڕاستە بەرهەمەکەیان خۆماڵی نییە، بەڵام لە سایەی سوید و بەلجیکاوە کاکاویان لێ نابڕێت.

له بـــازاره سەربەخۆکانیشـــدا (duty free) نەســـتەلەکان له پـاکەتی ڕەنگاوڕەنگــدا پێچــراونەتەوه و لەســەریان نــووسراوه (made in Belgium) له بولگاریا دروست کراوه.

کەس جوتیـاره ماندوونەناســەکانی دوورگەی " Papua New Guinea"ی سەر ڕووباری غانا و ڕۆژئاوای ئەفریقا ناناسـێت. ئەوانەی بە پیر و گەنج و منالٚ و گەورەوه خەریکـی کـارکردنن له دامێنی چیاکـانی ئالـپ، که هەر دەلٚێـی درەختـی کاکـاو بە تۆپەلٚ لێی ڕوواوه. لەوێ دەنکۆلٚەکان کۆ دەکەنەوه و دەیهـاڕن. کچەکانیش هەر له منداڵییەوه لەگەلٚ شیری مانگاکان تێکەلٚیـان دەکەن و دەیکەنە نەستەلە.

بەلٚێ، ئەوروپا له بابەتی نەستەلەدا باشن.

بەلاٚم ئەو بـــابەتەی ئەوان زۆر تیایـــدا باشـــن، بـــریتییە له داگیرکردنـــی ولاٚتـــان و کوشـــتن و بەکـــۆیلەکردنی خەلٚکـــی و کارپێکردنیانە تا مردن.

ئایـــا ئەو کـــاغەزە ئـــالٚتوونییە بـــریقەدارەی نەســـتەلەکانی داپۆشیووە، دەتوانێت ئەو داگیرکاری و زولٚم و زۆرەی له گەنج و پیر و ئافرەت و پیاوە ڕەنجبەرەکان و ئەو منداڵانەی تـا ئێسـتا تامی نەستەلەیان نەکردووە داپۆشێت.

- ها؟ چی دەلٚێن؟



# درەختی شۆڕەبی ڤان هێڵمۆنت



**جان باپتیستا ڤان هێلمۆنت** "Jan Baptista Van Helmont" زانـــا و فەیلەســـوف بـــوو. یەکێـــک بـــوو لە زانـــا زۆر پێشکەوتووەکانی سەدەی ١٧؛ بە ئەندازەی هەموو زاناکانی تـر زانا بوو. خـاوەنی دوو تایبەتمەنـدی بـوو کە پێویسـتە هەمـوو زاناکان خاوەنی بن، ئەویش: تامەزرۆیی (مەراق) و ئـارامگرتن بوو.

لە ماوەی ژیانیدا سەری خستبووە سەر هەنـدێک بـابەت، کە بووبـووە مـایەی پەرۆشـی زۆربەی زانایـان و سـەریان لـێ دەرنەدەکرد. وەك: مس و ئاسن و چەند شتێکی تر تێکەڵ بکەن و ئاڵتوونی خاوێن دروست بکەن، گیراوەیەك دروسـت بـکەن هەرچی بیخواتەوە نەمرێت، مێروولە لە شەکر دروسـت بـکەن کە ئەمانە تەنها چەند دانەیەک بوون. واتە شتی زیاتر هەبوو.

بە بۆچوونی **هێڵمۆنت**: ژیان لە ئاو و هەوا پێک هـاتبوو، بـۆ ســـەلماندنی ئەم بیرکردنەوەیەشـــی بڕیـــاری دا بە کردنـــی تاقیکردنەوەیەک کە پێنج ساڵی خایاند.

سەرەتا ١٠٠ کیلۆ لە گڵی هێنا و لەناو گوڵدانێکدا داینا، دواتر لقی درەختێکی شۆڕەبی هێنا کێشی ٢,٥ کیلۆگرام بوو و لەناو هەمان گوڵداندا ڕواندی و بۆ ماوەی پێنج ساڵ جگە لە باران؛ ڕووەکەکە بە هیچ ئاوێکی تر ئاو نەدرا. ئەو گەڵایانەی لە درەختەکە بەردەبوونەوە، کۆی دەکردنەوە و دەیکێشان و لای خۆی تۆماری دەکردن.

دوای پێنج ساڵ، درەختە شۆڕەبییەکەی هێڵمۆنت گەورە و سەوز و قوورس بوو. کێشی درەختەکەی هێڵمۆنت نزیکی ٨٥ کیلۆ بوو. بەڵام ئەو گڵەی پێنج ساڵ لەمەوپێش لە گوڵدانەکەدا دینابوو، تەنها ٥٠ گرامی کەم کردبوو.

- باشە درەختە شۆڕەبییەکە ئەو هەموو کێشەی لە کوێوە وەرگرتبوو؟

هێڵمۆنت وتی: "هەر بەم جۆرە بیردۆزەکەم سەلماند، درەخت بە ئاو دەژی نەک بە گڵ! چونکە گڵ هەرچۆنێک بێت، وەک ئەوەی هەیە دەمێنێتەوە!"

هەر کاتێک ئەم تاقیکردنەوەیەی هیلمۆنتم بیر دێتەوە، ڕاستەوخۆ بەسەرهاتی "جگەر"ەکەی مەلای مەشهوورەم دێتەوە یاد.

ڕۆژێک مامۆستا سێ کیلۆ جگەر دەکڕێت. خێزانی مامۆستا دراوسێکانی بانگهێشت دەکات بۆماڵەوە. هەموو پێکەوە جگەرەکە دەبرژێنن و دەیخۆن، دواتر بەسەریدا قاوەیەکی سادەش دەخۆنەوە.



کاتێک مامۆستا دێتەوەماڵەوە بە خێزانەکەی دەڵێت: "ژنەکە ژنەکە، جگەرەکە لەکوێیە؟"

خێزانی مامۆستاش دەڵێت: "کوێرایی دابێت پشیلەکە خواردی!"

ئەمە مامۆستایە! تۆ بڵێی پەکی بکەوێت؟ دواتر پشیلەکە هەڵدەگرێت و دەیکێشێت. کێشی ئەو ئاژەڵە بە ئەستەم دەگاتە سێ کیلۆ (یەکەی کێشە).

دوای ئەوەی مامۆستا ئەمە دەبینێت، دەپرسێت: " ئەگەر ئەمە پشیلە بێت، ئەی جگەرەکە لە کوێیە؟ یاخود نەخێر ئەگەر ئەمە جگەر بێت، ئەی پشیلەکە لەکوێیە؟". دواتر مامۆستا کێشی خێزانەکەی و هەموو دراوسێکانی دەپێوێت و بەو جۆرە ڕاستی بابەتەکەی بۆ دەردەکەوێت.

بەدڵنیــاییەوە ئەم بەســەرهاتەی هــات دوور و نزیـك هــیچ پەیوەندییەکی بە بابەتەکەمانەوە نییە. خۆی لە ڕاستیدا من نـاڵێم "هەیەتی... دەڵێم هات بە مێشکمدا".

ناشکرێت بە دڵنیایەوە بڵـێم "پەیوەنـدی نیـیە" کـێ دەزانێـت ڕەنگە پەیوەندییان بەیەکەوە هەبێت؟ ئیـتر ئەم دنیـایەیە هەمـوو شتێ ئەگەری ڕوودانی هەیە.

هێڵمۆنــت، گرنگــی ڕۆڵــی ئــاو و هەوای ئاشــکرا کــرد لە گەشـــەکردنی درەخـــتەکەدا، ئەمەشـــی بە تـــاقیکردنەوەیەک سەلماند.

تـــاکو ئێســـتا هـــیچ کێشـــەیەک نیـــیە. بەڵام لەم کـــارەدا هێڵمۆنـــت چەنـــد شـــتێکی هەیە تـــا ئێســـتا نایزانێـــت و هەرگیزیش ناتوانێت بیزانێت.

## ئۆکسجین

لە ساڵی (١٧٧٤ز)دا داهێنەرێک بە ناوی **جۆزێف پریستلی**-(Joseph Priestley) وەکـو خولیـایەکی خـۆی بـۆ زانسـت و داهێنان، وەک زانایەک دەستی بە کار کرد و لە چەند بـوارێکی گرنگدا پێشکەوتوو بوو. دواتر هەستا بە داهێنانی چەند شتێکی سەرسوڕهێنەری وەک "سۆدە" کە بە تێکەڵکردنـی ئـاو و دووانە

ئۆکسیدی کاربۆن دروستی کرد (بە باوکی خواردنەوە گازییەکان ناسێنراوە) و هەروەها گازی پێکەنینیشی ئاشکرا کرد (dinitrogen monoxide) هەر لە کاتی هەڵمژینیدا کەسەکە دەخاتە قاقای پێکەنین.

بەڵام ئەو گازەی ئەو ڕۆژە لە ئەنجامی چەند تاقیکردنەوەیەکدا لە تاقیگەکەی ئاشکرای کرد، لە ئەوانەی پێشووی نەدەچوو. وای کرد مۆمەکان زۆر زیاتر بدرەوشێنەوە!

هات ئەو گازە نادیارەی لەگەڵ مشکێکدا کردە شووشەیەکەوە.

مشکە بەستەزمانەکە لە ناو شووشەکەدا، لە چاوەڕوانی گیانکێشاندا بوو بۆ ئامانجی زانستی، بەڵام شتەکان وا نەبوون، چونکە زۆر زیاتر لەوەی چاوەڕێی دەکرد ژیا. تەنانەت ئەم مشکە دواتر لەگەڵ کۆمپانیای بەرهەمهێنانی فیلم؛ **واڵت دیزنی** ڕێککەوت و بوو بە ئەکتەر. بەڵام ئیتر دیار نییە کەی مردووە. ئەوەش بابەتێکی ترە...

پریستلی هەر بەوەوە نەوەستا و هەستا بە هەڵمژینی گازەکە " بزانم چی ڕوو دەدات" ئەمەی وت و گازەکەی هەڵمژی. دوای هەڵمژینی هەستی بەئاسوودەی و پشوودانێک کرد. وتی: ''خراپیش نییە" و جارێکی تر گازەکەی هەڵمژییەوە.

کـابرا ئۆکسـجینی دۆزیبـووەوە، بەڵام جـاریَ نەیـدەزانی چییە.

خۆی لە ڕاستیدا زاناکـان لە پێش بریسـتڵییەوە ئۆکسـجینیان ئاشکرا کردبوو. بەڵام بریستڵی پێشـیان کەوت و نـاوی لـیَ نـا ئۆکسیجێنیۆم (oxygenium).

دوای مـــاوەیەکی کـــورت، ڕەنـــگە دوای ئەوەی بە دارسـتانێکی چـڕی پـڕ ئۆکسـجیندا گەڕابێـت و وا بیـری کـردبێتەوە ئەو گـازە نادیـارە دەکرێـت ئۆکسـجین بێـت. زیـاتریش ڕووەکەکـان و بەتـایبەت درەختەکـان دەکرێـت ئەو هەوایە بە ئۆکسـجین پـاک بـکەنەوە کە لەلایەن ئاژەڵەکانەوە پیس کراون.

لە ڕاسـتیدا ئەوە سـەرکەوتنێکی گەورەیە تـوانیبێتی سـەرەڕای ئەو زانیارییە کەمانەی بەو شێوەیە بیری کردبێتەوە.

بە خـۆی دەڵێـت: "کـارێکی باشـت کـرد!" بەردەوامـی بە ڕێگەکەمان دەدەین....



دوای ماوەیەکی کورت، زانایەکی تر هەنگاوێکی نوێ دەنێت بۆ ئەم ڕووداوە.

لە ڕاستیدا ئەم کارانە هەر وان؛ دەبێت هەنگاو بە هەنگاو بۆی بڕۆیت، بەڵام ئەوەی گرنگە کۆڵ نەدانە.

زانایەکی تر بە ناوی **جان ئینگنهاوز** - (Jan Ingenhouz) لێکدانەوەیەکی سەیری کرد سەبارەت بە پاکردنەوەی هەوا لە ڕۆژدا؛ لەلایەن ڕووەکە سەوزەکانەوە. ئەم لێکدانەوەیە ئێجگار گرنگ بوو، چونکە لە لێکدانەوەکەدا جگە لە ئاووهەوا، ڕووناکیش دەگرێتە خۆ. لە ڕاستیدا هێشتا زووە بۆ ئەوەی ڕۆڵی ڕووناکیمان بۆ دەربکەوێت. بەڵام کەم نییە ڕۆڵی ڕووناکییش بزانیت....

دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک، لەساڵی ١٧٨٢ **جان سێنێبیەر** - (Jan Senebier) ئەوەی ئاشکرا کرد ڕووەکەکان بۆ "پاکردنەوەی هەوا" واتا بۆ دروستکردنی ئۆکسجین پێویستیان بە دوانە ئۆکسیدی کاربۆن هەیە. بەم جۆرەش مرۆڤایەتی هەنگاوێکی موعجیزەی گەورەی نا، لە ئاشکراکردنی شتێکی نوێ لە گەردووندا.

دواتر زاناکان زیاتر پێشکەوتن و لە ناوەڕاستی ساڵی (١٨٠٠)ەکان گەیشتنە ئەوەی ڕووەکە سەوزەکان دوانەئۆکسیدی کاربۆن هەڵدەمژن و ئۆکسجینی لێ بەرهەم دەهێنن؛ بۆ ئەم پرۆسەیەش پێویستیان بە ئاو و خۆر هەیە.

بەڵام هەرگیــز نەکەن هەڵە تێــبگەن! چــونکە بەدوای ئەوەوە بوون بزانن ئەمە "بە چ شێوەیەك" ڕووی دا، نەك "چـۆن" ڕووی دا.

لە سەرەتاکاندا وا دەزانرا ڕووەکەکان لەم کردارە بەرپرسن.

واتە چۆن مرۆڤ و ئاژەڵەکـان ئۆکسـجین هەڵـدەمژن و دوانە ئۆکسیدی کـاربۆن فـڕێ دەدەنەوە، بە هەمـان شـێوە وا دەزانـرا ڕووەکەکانیش دوانە ئۆکسید هەڵدەمژن و ئۆکسجین دەدەنەوە!

ڕووداوەکە بەم شــێوەیە بــوو، بەڵام لە ڕاســتیدا بەم شــێوەیە نەبــوو! بەتـایبەت کاتێـک لە سروشـتی ڕوونـاکی تێگەیشـتن، کارەکە ڕەنگی گۆڕا...

زانـــایەکی تـــر لە ســـاڵی (١٨٤٢ز)دا بە نـــاوی **ڕۆبێـــرت مـــالەر** - (Robert Maler) ئاشـــکرای کـــرد ڕوونـــاکی وزەیە و بە کـــــارلێکی کیمایـــــی ڕووەکەکـــــان، ئەو ڕوونـــــاکییە دەگـــــۆڕن بە وزە و ژیـــــانی پـــــێ دەکەن. ئەم ڕووداوەش ناوێکی بۆ دۆزرایەوە؛ ڕۆشنەپێکهاتن.

ڕێک دوای چل ســاڵ **سـیدۆر ولیـام ئێنگەلمـان** - ( Thedor William Engelman) ئەوەی ئاشـکرا کــرد ئۆکســجین لە ئەنـدامێکی نـاو خـانەی ڕووەکەوە دروسـت دەبێـت، کە پێـی دەڵێن؛ سەوزەپلاستید.

له ساڵی (١٩٠٠)ەکاندا، وردەکارییەکانی موعجیزەی ڕۆشنەپێکهاتن دانە دانە دەرکەوتن. ڕۆڵی ئاو لە دروستبوونی ئۆکسجیندا ئاشکرا بوو.

هەندێک لە زاناکان بەهۆی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەو بابەتەدا کردبوویان، خەڵاتی نۆبڵیان وەرگرت.

ڕۆشنەپێکهاتن، جگە لەوەی کۆئەندامی هەناسەی درەخت و ڕووەکەکانە، لەوە تێگەیشتن زۆر کاری لەوە زیاتریش دەکات.

بەڵێ! ئینجا با پێتان بڵێم بابەتەکە چ پەیوەندییەکی بە جگەرەکەی مەلای مەشهورەوەیە!

ڕۆشنەپێکهاتن پەیوەندی بە هەموو ئەو شتانەوە هەیە کە بەسەر ئەم زەوییەوە دەفڕن، دەگەڕێن، ڕادەکەن و لە هەوڵی تێرکردنی گەدەیاندان!

ئیتر با گیاخۆر بێت، گۆشتخۆر بێت، هەردووکی بێت یاخود بەیەکەوە، لەگەڵ کەسێکدا یان شتێکدا بێت....

## ڕووناکی هەڵبژێردراو

سێ هاوڕێ لەناو خۆیاندا دەفرێک هەڵدەگرن و پڕی دەکەن لە چەرەسات، دواتر دەست دەکەن بە پاککردنی و دەیخۆن. دوای نیو کاتژمێر، ئەگەر لە دەفرەکەدا لە نێوان فستق و بوندق

و بایەم و گوێزدا تەنها نۆکی خۆشکراو مـابێتەوە، ئەوا نـاتوانین وەکو ڕێکەوتێک لێکدانەوەی بۆ بکەین!

چـونکە ئەمە ئەوە نیشـان دەدات ئەو سـێ هـاوەڵە، فسـتق و بوندق و گوێزەکانیان هەڵبژاردووە بۆ خواردن و سـەیری نـۆکە خۆشکراوەکەیان هەر نەکردووە.



خۆ ئەگەر لە دەفری چەرەسەکەدا تەنهـا نـۆکە خۆشـکراوەکە بخورێت، دیسان نـاتوانین وەکـو ڕێکەوتێـک لێکـدانەوەی بـۆ بکەین!

تەنهـــا دەتـــوانین بڵێـــین هەرســـێکیان لە منـــاڵییەوە هەر نۆکخۆر بوون!

لایەنی گاڵتەوگەپەکەی بخەینە ئەولاوە، هەرچـی لەسـەر ئەم هەسارەیە ژیاوە و دەژی، ناتوانین وەکو ڕێـکەوت لێکـدانەوەی بۆ بکەین!

چونکە هەر شتێک کە دروست دەبێـت یـان ڕوو دەدات، بەم شـێوەیە یـان ئەو شـێوەیەی بـۆ نیـیە. بەڵکـو لەنێـو هەزاران و چەنـــدین ئەگەر کە نە بە ژمـــاردن و نە بە هاوکێشـــە و نە بە لێکدانەوە هەژمار دەکرێت؛ هەڵبژێردراون.

بـــــــۆ نمــــــــــوونە، تیشـــــــــکی خـــــــــۆر، ١٠)١٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ سـێپتیلۆن) شـەپۆلی جیـاواز لەخـۆ دەگرێـت؛ تەنهـا یەک شەپۆلیان دەتوانێت بە بەرگەهەوادا تێپەڕ ببێت.

لە نێـوان ١٠ سـێپتیلۆنی شـەپۆلی ڕووناکیـدا، ئەو تـاکە ڕوونـاکییەی بە بەرگەهەوادا تێـپەڕ دەبێـت نەك گونجـاوترین، بەڵکو تاکە تیشکی گونجاوە بۆ ئەو پەپـوولە بـاڵ نەخشـینانەی پێویستیان بە وشکبوونەوەی قۆزاخەکەیانە تا بێنە دەرەوە، یان بۆ ڕۆشنکردنەوەی چـاوی هەنگەکـان تـا ڕێگەکەیـان بـدۆزنەوە، یاخود بۆ گەڵایەك لە پرۆسەی ڕۆشنەپێکهاتندا.

## ئەو گەڵایانە بۆ هێندە سەوزن؟

هەموو شـتێک ئیـتر لەو تیشـکەوەیە، ئەو تیشـکە بە خێرایـی ڕووناکی و لە دووریی سەد و چل و نۆ ملیـۆن و شـەش سـەد هەزار کیلۆمەترەوە لە ٨ خولەکدا دەگاتە سەر زەوی. کاتێـک بە بەرگەهەوادا تێپەڕ دەبێت، وەکو پەردەیەکی ناسک، چین چـین

هەسارە شینەکەمان دادەپۆشێت و گەڵا تەنکەکانی درەختەکـان پڕشنگدار دەکات...

ئەو سەوزەپلاستیدەی لە خـانەی گەڵاکانـدایە چەنـدەها ئەندامی ورد وردی تێدایە و وا بونیاد نـراون توانـای وەرگرتنـی ئەو تیشکەیان هەبێت. دەتوانیت وەکو پانێڵێکی وزەی خۆر بیر لەو ئەندامانە بکەیتەوە. بەڵام ئەوەندە بچووکن یەک ملیمەتـری سەر گەڵاکە بە سەدەها و هەزارەها ئەندام لەخۆ دەگرێت.

لەنـاو سەوزەپلاستیدیشـدا، مـاددەی ڕەنگیـی هەیە بە نـاوی کلۆرۆفیـل (chlorophyll). ئەوانەی پەرتـووکی "ڕەنـگ و ڕووناکی"یـان خوێنـدووەتەوە، بە بیریـان دێـتەوە مـاددەی ڕەنـگ چیـیە. بـۆ ئەوانەشـی جـارێ نەیانخوێنـدووەتەوە، کـارێکی جوانیـان پێشـکەش دەکەم و بە کورتی بە بیریان دەهێنمەوە:

ڕوونـاکیی سـپی هەمـوو ئەو ڕەنگـانە لەخـۆ دەگرێـت کە لە خۆرەوە دێت. گەڵای درەختێک، پەڕی چـۆلەکەیەک، تـاڵێکی قژ، بۆیەی پاسـتیل... بینینـی ئەو هەمـوو ڕەنگـانە بە چاومـان هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی مادده جیاوازەکانی ڕەنگ.

لەبەر ئەوەی هەر ماددەیەکی ڕەنـگ، هەنـدێک لە ڕەنگەکـان هەڵدەمژێت و هەندێکیشـی دەداتەوە، ئەو ڕەنـگەی دەیـداتەوە لەسەر ڕووی شتەکان دەردەکەوێت.

بۆ نموونه ڕەنگی سەوزی گەڵاکان دەکرێت هۆکاری ئەوە بێت ماددە ڕەنگییەکانی کلۆرۆفیل لەناو سەوزەپلاستیددا ڕەنگی سوور و شین هەڵدەمژن و ڕەنگی سەوز دەدەنەوە.

هەر لەبەر ئەم هۆکارەشە ئێمە گەڵا گەنج و نوێیەکان بە سەوز دەبینین.

- ئەی باشە بۆچی؟

- بۆچی کلۆرۆفیل بەم شێوەیە دروست کراوە؟

- مادەم هیچ شتێکی ئەم گەردوونە بە ڕێکەوت بونیاد نەنراوە، کەواتە نابێت ئەمەش هۆکارێک، یاخود ڕاستتر بڵێین حیکمەتێک لەخۆ بگرێت؟

بەدڵنیاییەوە هەر وایە! کاری کلۆرۆفیل تەنها ئەوە نییە ڕەنگی سەوز بدات بە ڕووەکەکان، بەڵکو کاری سەرەکی ئەوەیە وزە کۆ بکاتەوە بۆ پرۆسەی ڕۆشنەپێکهاتن.

لە نێوان ڕەنگەکانی خۆردا، ڕەنگی مۆر-شین و ڕەنگی سوور-زەرد کە دەکەونە ئەمسەر و ئەوسەری شەبەنگی ڕەنگەکان؛ زۆرترین وزە پێک دەهێنن.

ماددە ڕەنگییەکانی کلۆرۆفیل تێروپڕ لەم ڕەنگە پڕ وزانە هەڵدەمژن. ئیتر ئەوەی لە شەبەنگی ڕەنگەکاندا دەمێنێتەوە ڕەنگی سەوزە، کە وزەیەکی کەمی هەیە.

ڕووناکی ڕەنگ سەوز بێبەرهەمترین ڕووناکییە، بۆیە ڕۆشنەپێکهاتن لە دۆخێکی ناچالاکدا دەبێت کاتێک ڕووناکی لە ڕەنگی سەوزدایە.

هەر بۆیە کلۆرۆفیل ڕەنگی سوور و شین هەڵدەمژێت و ڕەنگی سەوز دەداتەوە و ئێمە گەڵاکان بە سەوز دەبینین.




## پێکهێنان بە ڕۆشنایی

ئەو خانانەی بەسەر ڕووی گەڵاکانەوەن ئەو ڕووە ساف و لووسەیان بە گەڵاکە بەخشیوە. بەم شێوەیەش خۆڵ و پیسی لەسەر گەڵاکان کۆ نابێتەوە و ڕووناکییەکانی خۆریش باشتر ڕووناکی دەدەنەوە.

هەر کەمێک خوار ئەوە، چینی خانەیەکی بازنەیی بەدی دەکەیت، کە لە شێوەی توولێکدا ڕیز بووە.

ئەو خانانە سەوزەپلاستیدیان تێدایە. سەوزەپلاستیدەکانیش پڕن لەو کلۆرۆفیلانەی کەمێك پێش ئێستا باسمان کرد.

کلۆرۆفیلەکانیی لەسەر ڕووی گەڵاکەوە تیشکی خۆر وەردەگرن و لە ژێر گەڵاکەشەوە لە ڕێی دەمیلەکانەوە هەواگۆڕکێ ڕوو دەدات.

کلۆرۆفیلی چینی سەرەوە تیشکەکان دەگرێت، لە دەمیلە بچووکەکانی چینی ژێرەوە هەوا دەچێتە ژوورەوە، لە چڵەکاندا ئاو هاتوچۆ دەکات و دەمارەکانی لەسەر ڕووی گەڵاکانیش بە هەموو لایەکدا بڵاو دەبنەوە.

ئاو و هەوا دەگەن بە هەموو خانەکانی گەڵاکە، کارگەیەکە بۆ خۆی.

دوای ئەوەی گەڵاکە ئاو و هەوا وەردەگرێت، کلۆرۆفیلەکان بەو وزەیەی لە خۆرەوە وەریانگرتووە گازی دوانەئۆکسیدی ناو ئاو و هەواکە دەگۆڕن بۆ **(کاربۆهیدرات)**.

کاربۆهیدرایت یەکێکە لە بەسوودترین ماددەی خۆراکی بۆ ڕووەک و ئاژەڵ و مرۆڤ و هەموو گیانلەبەران بەبێ جیاوازی. دەشتوانین پێی بڵێین شەکر!

هەر بۆیە درەختە شۆڕەبییەکەی هیلمۆنت لە ماوەی پێنج ساڵدا کێشی زیاد بوو، بێ ئەوەی کەس درکی پێ بکات ئەو شەکرە شاراوەیەی وەردەگرت!

## پاشماوە: ئۆکسجین!

وەک دەزانن مرۆڤ هەر شتێک دروست بکات، ئەوا لە ئەنجامدا کۆمەڵێک پاشماوەی دروست دەبێت.

بۆ نموونە، دوکەڵکێشی کارگەکان ماددەی ژەهراوی فڕێ دەدەنە ناو ئەو هەوایەی ئێمە هەڵیدەمژین، لە ڕێگەی بۆرییە دوور و درێژەکانەوە ئەو ماددە ژەهراویانە بەسەر ڕووبار و دەریا و جۆگە و گیانی ماسیەکاندا دەکەن.

بەدڵنیاییەوە لە ئەنجامی دروستبوونی ماددەی شەکر لە گەڵاکاندا، پاشماوەیەکیان لێ بەجێ دەمێنێت. گەڵاش بە ملیۆنەها ساڵ ئەو پاشماوەی ماددەیە دەکاتەوە ناو بەرگەهەواوە. بەڵام نیگەران مەبن، چونکە پاشماوەکەی ئەوان ئۆکسجینێکی فرێشە.

زاناکان تا ئێستا سەریان لەوە دەرنەکردووە ئەم پرۆسە سەرسوڕهێنەرەی ڕۆشنەپێکهاتن چۆن بە تەواوی ڕوو دەدات.

ئەو گەڵایانەی وەک کاغەزی بچووک وان و بە ئەندازەی پەڕەیەک چەندەها هاوکێشەیان تێدا نووسراوەتەوە ئەو

ڕاستییەمان بۆ دەردەخەن، کە ئەمە جگە لە دەرئاسابوون هیچی تر نییە.

بیر بکەرەوە! هەموو ڕۆژێك لەسەر هەموو گەڵاکانی سەر ڕووی زەوی ...

"ڕۆشن" بەواتای ڕووناکی دێت و "پێکهاتن"یش بە واتای تێکەڵکردن دێت؛ ڕۆشنەپێکهاتن بە واتای پێکهێنان بە ڕۆشنایی دێت، بەڵام بە بڕوای من ئەمە برژاندنە، برژاندن لەسەر مقەڵی. لای من ڕۆشنەپێکهاتن لەوە دەچێت بە ڕووناکی برژابێت، هەر وەک چۆن شتێک لەسەر ئاگرێکی کز دادەنێیت.

## ڕۆشنەپێکهاتن: برژاندنی کەباب بە ڕووناکی

ژیانی هەموو ئەم سەر زەویە بەندە بەو ڕۆشنەپێکهاتنەی لە نێو سەوزەپلاستیدەکاندا ڕوو دەدات، کە درێژییان یەك لەسەر هەزاری ملیمەترێکە.

ئەو گەڵایانەی سەر زەوی وەک کارگەیەک بونیاد نراون، ئەگەر ڕۆژێک لە کارکردن بوەستن، ئەوا دوای ماوەیەکی کورت دنیا دەبێ بە شوێنێک توانای ژیانکردنی تێدا نامێنێت.

گەڵای درەختەکان لە هەوڵدانـدان بـۆ دروستکردنی کاربۆهیدرات لە ئاو و هەوا؛ بە بەکارهێنانی تیشکی خۆر. هەر

بـۆیە بەمەش خـۆراکی خۆیـان دابـین دەکەن. ئاژەڵەکـانیش بە خواردنی ئەو ڕووەکانە تێر دەبن. مرۆڤەکانیش لەسـەر سـفرەی گەردووندا هەر ئاژەڵێک، یاخود ڕووەکێـک گونجـاو بێـت بـۆ خواردن؛ دەیخۆن و تامی دەکەن.

ئەگەر بێت و ڕووەکەکان نەچنە پرۆسـەی ڕۆشـنەپێکهاتنەوە، ئەوا گەشـە نـاکەن. ئەگەر ڕووەکەکـانیش گەشـە نەکەن، ئەوا ئاژەڵەکانیش گەشـە نـاکەن. ئێـوەش بەیـانییەک تاماشـا دەکەن لەسەر سفرەکانتان هیچ کام لە نان و هـێلکە و شـفتە و شـیر و هەنگوین بوونی نییە.

چونکە گەنمەکان پێش ئەوەی گەشە بـکەن، وشـک دەبـن و نامێنن. مریشکەکانیش نە بژارێـک دەبێـت بیخـۆن، نە دەنکـی گەنمەشامییەکان، بۆیە زۆربەیان لە برساندا دەمـرن. ئەوانەشـی کە دەمێنن توانای دروستکردنی هێلکەیان نامێنێت.

حـاڵی مانگاکـانیش زۆر نـاخهەژێن دەبێـت! لەبەر ئەوەی سـەوزاییەك نـادۆزنەوە بـۆ گەدە گەورەکەیـان. چـونکە ئەو ڕووەکانەی ڕۆشنەپێکهاتنیان نەدەکرد، یان وشک دەبوون، یـان کەمێکیان سەریان لە خاکەکەوە دەردەهێنـا. ئەو مانگـا برسـیانە هیچ شیرێکیان بەرهەم نەدەهێنا.

واز لە شـیر بهێـنن، دوای مـاوەیەکی کەم لە دەشـتەکاندا نە مانگا، نە وشتر، نە مەڕ نەدەبینرا، چونکە هەموویان لە برسـاندا دەمردن.

بەڵـێ بەڕاسـتی زوو بڕیارمـان داوە! ئەو جـگەرەی مامۆسـتا نەسرەدین نەیخواردبوو، پەیوەندییەکی بە بابەتەکەمانەوە هەبوو! پەیوەندییەکی زۆر نزیکیش....



ئەوە تەنهـا دەبـوو بە خەونێـک لەلای هەنگەکـان، کە بـۆ سووڕی ژیانی گوڵەکان بڕۆنە باخچەیەکەوە و لەسەر گوڵەکان بنیشنەوە.

بۆ ئێمەش بوونی هەنگوینێکی وەک ئاڵتوون بە تیشکی خـۆر بدرەوشێتەوە؛ دەبوو بە خەونێک.

ئەگەر بەیانییەک ڕووەکەکان لە کرداری ڕۆشنەپێکهاتن مانیان بگرتایە، هەموو ئەو ڕووداوانە ڕووی دەدا.



هەر بـۆیە لە گەردوونـدا بە ملیارەهـا ملیارەهـا درەخـت و بە ملیارەهـا ملیارەهـا گەڵا هەمـوو بەیـانییەک لەگەڵ هەڵهـاتنی خۆردا دەست بە کار دەکەن.

خودای گەورە ئەو کارگە زۆرانەی لەناو گەڵاکاندا بونیاد ناوە کە بە ئەنـدازەی لەپـی دەسـتێک دەبـن و بە درێژایـی ڕۆژ کـار دەکەن.

سەوزەپلاستیدەکان لە خـۆرەوە ڕوونـاکی وەردەگـرن، ئـاو و دوانە ئۆسیدی کاربۆن لەو فڕنە بچووک بچووکانەدا دەبرژێنن و خۆراکێکی وەک شەکر دروست دەکەن.

ئەو خۆراکانەشـــی کە دروســـت کـــراون، لە گەڵاکـــانەوە بـــۆ لقەکان و لەم پەل بۆ ئەو پەل دەگوازرێنەوە.

هەیە دەبێتە گەنم و هەیە دەبێتە گەنمەشـامی و هەشـە دەبێـتە سێو، هەشیانە دەبێتە مۆز و هەندێکیان دەبێت بە گژوگیا...

دواتـــر ئەوانە لەلایەن مریشـــکەکانەوە دەخـــورێن و هـــێلکە بەرهەم دەهێنن، لە لایەن مانگاکانەوە دەخورێن و دەبن بە شیر، لەسەر تاوەش دەبێتە شفتە و لەسەر مقەڵیش دەبێتە کەباب...

هەنگەکانیش کۆی دەکەنەوە و دەبێتە هەنگوین.

هەر بـــۆیە بە بەکارهێنـــانی ڕوونـــاکی خـــۆر وەکـــو وزە، دروسـتکردنی ئەو خـواردنەوە شـیرینانە لە ئـاو و هەوا، پـێش هەموو شتێک لە ملیۆنەها گەڵادا دەبرژێن، دواتـریش تـا سـەر سفرەکانمان دێن.

ڕووناکی دەخۆین، ڕووناکی دەخۆینەوە....

لە کۆتـایی هەمـوو شـتەکاندا بە مێشـک و هزرمانـدا دێـت سوپاسی ئەو خودایە بکەین، کە لە ڕوونـاکیی خـۆر ئـێمە تێـر دەکات.

هەر وەک بە ئەنـــدازەی ژمـــارەی هەمـــوو درەختەکـــان. بە ئەندازەی هەموو لقەکان و گەڵاکان. بە ئەنـدازەی ژمـارەی ئەو کلۆرۆفیلانەی لە میلیمەتری گەڵایەکدان. بە ئەندازەی ژمـارەی کلۆرۆفیلەکان دەڵێین: "الحمد لله".

به ئەندازەی هەناسەدانمان لە بەیانیانـدا، کـردنە دەرەوەی هەر گەردێکـــی ئۆکســـجین لە دوکەڵکێشـــەکانی کـــارگەی ڕۆشنەپێکهاتن بۆ ناو هەوا، سوپاسی خودای گەورە دەکەین!

ئەگەر درەختەکـان قەڵەم بـن و زەریاکـان بـبن بە مـورەکەب، هەمــوو نــیعمەتە نەبڕاوەکــان بژمێــرین و بنووســین ... لەبەر هەنجیر، زەیتوون و هەنار... لەبەر یەک هەناسە و یەک قـومی ئاو و زیاتریش تا شوکرانەی تۆ بکەین!

سوپاس و ستایش بۆ تۆ خودایە، سوپاست دەکەین....



# درەختە زۆر سەرسوڕهێنەرەکان



شازادەیەکی بەستەزمان خـراپ گیـری خواردبـوو بەدەسـت درەختی (باوبـاب)ەوە، کە لە هەسـارە بچووکەکەیـدا بە نـاوی (b-٦١٢)ە ڕوابوو.

ئەم شازادەیە لەبەر خۆیەوە وتـی: "بـا بچـم هەوایەك بگـۆڕم و هەندێ شوێنی جیاواز ببینم" بـۆیە سـەردانی زەوی کـرد. بەڵام دڵی هەر لای درەختە باوبابەکەی بوو لە هەسارە بچووکەکەیدا. ئـاخۆ کـێ ئاگـای لـێ دەبێـت کاتێـك چـرۆ دەکـات و کـێ گەڵاکانی خاوێن دەکاتەوە؟

هەموو ساتێك ئەوەی لەبەرچاو بوو. بەرخەکەی دێت و هەر بە چرۆیی دەیخوات؛ ئەو ناوە تێك دەشێوێنێت!

ئەی ئەگەر نەیخوات؟! ناخۆشمان کرد! باشە ئەمە بە من چی؟ باسـی شـتێکی ترمـان دەکـرد، ئەم باوبـابە چـی بـوو سـەری دەرهێنا؟ باشە دەی وەرن با باسێکی ئەم درەختی باوبابەتان بـۆ بکەم و بیکەین بە دەمە تەقێ.



# درەختی باوباب

لە لیستی درەختە زۆر سەرسوڕهێنەرەکاندا، یەکێک لەو درەختانەی زۆر لام خۆشەویستە؛ بریتییە لە درەختی باوباب. کە لاشەیەکی قەڵەوی وەکو بەرمیلی هەیە.

ئەم درەختە سەرسوڕهێنەرە لە ئەفریقا، ماداگاسکار (کە دورگەیەکە لەسەر دەریای هیند لە ئەفریقا) و هەندێک لە جۆرەکانی تریشی لە ئوستراڵیا دەژین. بەتایبەت کاتێک گەڵاکانی دەوەرێت، ڕەگەکانی بەرەو سەرەوە گەشە دەکەن و وەک ئەوە دەردەکەون سەربەرەوخوارەوە بن.

ئەم درەختانە تەمەنیان زۆر درێژە، دەڵێن بۆ ماوەی نزیکی ٥ هەزار ساڵ دەژین.

میوەیەکی هەیە لە ناوەوە وەکو ئـارد وایە و ڕووی دەرەوەشـی ئەستوورە. مەیموونەکان زۆر حەزیـان لەم میـوەیەیە. هەر بـۆیە درەختی باوباب درەختی "خۆراکی مەیموون"یشی پێ دەڵێن.

درێـژی درەختــی باوبـاب لە ئەفریقـا؛ بیســت مەتـر دەبێـت. هەروەهـا تیـرەی لاشــەی درەخــتەکە زۆر فـراوانە. ئەم لاشــە زەبەلاحەیـــان کە دەڵێـــی فـــیلە؛ لە نـــاوەوە بەتـــاڵە. لە نـــاو درەختـــی باوبابـــدا هەنـــدێک لە هـــۆز و قەبـــیلە ماڵیـــان دروست کردووە و تێیدا دەژین.

واتـا شـازادە بچـووک، تـۆ بەبـێ هۆکـار دەترسـیت! بینیـت درەختی باوباب زۆر گەورە بووە و شوێنێک نەماوە بۆ خەوتنت لە هەسـارەکەدا، بـڕۆ نـاو درەخـتەکە و بـخەوە؛ چـی تیـایە؟ بەتـایبەت بەیانیـانیش کێشــەی هێنـانی ســەمونت نابێـت لە سەمونخانەکە! جگە لەمەش ئەگەر سەرمات ببێت و تـات لـێ بێت، ئەوا بە توێکڵەکەی داتدەپۆشێت.

دەڵێن توێکڵەکەی مـاددەیەکی تێـدایە هاوکـاریی دابەزانـدنی پلەی گەرمی لەش دەکات (تا).





## درەختی خوێنی ئەژدیها

یەکێک لە درەختە سەرسوڕهێنەرەکان و لەهەمان کاتدا یەکێک لە درەختە زۆر دەگمەنەکان، بریتییە لە درەختی خوێنی ئەژدیها.

ئەم درەختە لە دارستانەکانی دوورگە سەرنجڕاکێشەکانی سۆکۆترا لە یەمەن بوونی هەیە.

ئەم درەختە جوانە تایبەتمەندییەکی هەیە کە لە درەختەکانی تردا بوونی نییە. ئەویش ئەوەیە ئەم درەختە بە درێژیی دە مەتر گەشە دەکات. ئەگەر لاشەی یاخود لقەکانی برینداربێت، ئەوا خوێنی لێ دێت.

بەدڵنیاییەوە ئەمە ئەو ماددەیە نییە کە لە دەمارەکانی جەستەی مرۆڤدا هاتوچۆ دەکات، بەڵام ڕەنگی سوورە و دڵنیام ئەگەر

بێت و داربڕێکی بێ بەخت ئەو درەختە ببڕێت، ئەوا لە شـوێنی پێداکێشـانی تەورەکەی، ئەو شـلە سـوورە دەبینێـت و بەخـۆی دەڵێت: "من چ هەڵەیەکم کرد؟" دواتر دەکشێتەوە دواوە..



## درەختی بانیان
## (درەختێکی هەنجیری هیندییە)

ئەم درەختە سەرسوڕهێنەرە، لە هیندستان دەژی.

لە ڕاستیدا درەختێکی تایبەتی هەنجیرە. وەکـو هەنجیـرەکەی خۆمان نییە.

ڕەگەکانی لە سەرەوە بۆ خوارەوە درێژ دەبێتەوە و دەچێتە ژێـر زەوییەوە؛ هەر لقێکـی درەخـتەکە بۆخـۆی ڕەگێـک لە زەویـدا دەچێنێت.

بەم شـێوەیە لاشـەی درەخـتەکە ئەوەنـدە گەورە دەبێـت، هەنـدێک لە درەختەکـانی بانیـان لە هەر کـوێ بـن، دارستانێک داگیر دەکەن.

بەپێـی دەنگۆیەکـان، کاتێـک ئەسـکەندەری مەکـدۆنی هیندستانی ئـازاد کـرد. حەوت هەزار کەس لەژێـر درەختێکـی بانیاندا خواردن و خواردنەوەیان خواردووە و ژیاون. لە ڕاستیدا ئەوە بۆ من زۆر ژیرانە نەبوو.

باشە دەکرێت ببێت! درەختێکی بانیان سەدەها سـاڵە ژیـاوە. ڕاسـتە دەکریـت ئەوەنـدە گەورە ببێـت، بە ئەنـدازەی ئەوەی حەوت هەزار کەس لەژێریدا پـاڵ بـکەون. بەڵام حەوت هەزار کەس بۆچی لەژێر درەختێکی بانیانـدا پـاڵ بـکەون؟ هەر بـۆیە ئەوەیـان مـن نەمزانـی، وای بـۆ دەچـم ئەو دەنگـۆیە تۆزێـک زیادەڕەوی تێدا کرابێت!

## درەختی لاستیک

کاتێک داگیرکەرانی ئەورووپـی پێیـان خسـتە نـاو ئەمریکـاوە، سەرنجی ئەوەیان دا خەڵکی ڕەسەنی ئەمریکای باشوور بە پێی پەتی لەناو دارسـتانەکاندا هـاتوچۆ دەکەن. خەڵـکە ڕەسـەنەکە قاچیان دەخستە ناو شلەیەکی لاستیکی سـپییەوە و شـێوەیەکی

جوانی دەدا بە قاچیان و هەستی باوەڕبەخۆبوونیان زیاد دەبوو. ئەوانە یەکەم پێڵاوی وەرزشی بوون لە مێژوودا مرۆڤ بینیبێتی!

یەکێــک لە داگیــرکەرە ئیســپانییەکان ئەگەر بیشــیوتایە: " لە لاستیکی ئۆتۆمبێل دەچێـت" ئەوا لەو کـاتەدا، نە ئۆتۆمبێـل، نە لاسـتیک دروســت نەکرابــوو. هەر بــۆیە لەبەر ئەوە نەیتــوانی بیڵێت!

خەڵکەکە بۆ پاراستنی پێیەکانیان، لاستیکیان لەناو پێڵاوەکاندا دادەنا. ئەو لاستیکەیان لە بڕینی لاشــەی درەخـتەکەوە دەسـت دەکەوت، کە ماددەیەکی سپی وەکو شیر بوو...



ئەم درەختە لە ناوچەی ئەمازۆن لە بەرازیل بوونی هەیە و قەدە بازنەییەکەی بە بەرزی بیست مەتر گەشە دەکات، بەڵام خەڵکانی ڕۆژهەڵات بە ڕێگەی قاچاخ ئەم درەختەیان بردووە و لە ناوچەکانی خۆیان ڕواندوویانە.

لە جیهاندا ئەوانەی پێویستیان بە لاستیکە، لەم درەختەوە ماددە خامەکەی بەدەست دەهێنن.

لاستیکی ئۆتۆمبێل، بنی پێڵاوەکان، دەستکێشی پزیشکەکان هەر شتێکی تر پێویست بکات نەرم و جیڕ بێت، ئەوا ئەو لاستیکەی بۆ بەکار دەهێنرێت.

لاستیک جیڕە و جۆرەها شێوەی لێ دروست دەکرێت، ئاو ناچێتە ناوی و لە بەردا پتەوە.

لاستیکی دەستکرد، هەرگیز کوالیتی وەکو ئەو لاستیکە سروشتیە نییە کە درەختەکان بەرهەمی دەهێنن.

لاستیکی ئۆتۆمبێل لە پاڵاوتەی دڵۆپ دڵۆپی درەختی لاستیک دروست کراوە، بە لامانەوە مەحاڵ و باوەڕپێنەکراوە وانییە؟ بەڵام ڕاستییەکە بەو شێوەیەیە!





# درەختی ژەهراوی مانشینێڵ

بەدڵنیـاییەوە گۆشـتی ژەهـراوی، میـوەی ژەهـراوی و گـوڵی ژەهراویتان بیستووە. ئەی باشە درەختی ژەهراویتان بیستووە؟

لە دوورگەکانی بەهاما؛ لە ناوەڕاست و باشووری ئەمریکـادا درەختـی مانشـینێل دەژی، خـاوەنی ژەهرێکـی بەهێـزە، هەر لەگەڵ دەستلێدانیدا پێست دەسوتێنێت.

واتا هەر کەسێک لە ژێـر سـێبەری ئەو درەخـتەدا دابنیشـێت، یاخود پاڵی پێوە بداتەوە، ئەوا کۆتا شت کە دەیبینێت بـریتییە لە لقی درەختەکە، ئەویش ئەگەر لەسـەر زەویـیەکە بەسـەر پشـتدا کەوتبێت!

ئەو درەختە ئەوەندە ژەهراوییە، ئەگەر لە ڕۆژێکـی باراناویـدا دڵۆپێک لە بارانەکە لەسەر گەڵاکەی بکەوێتە خوارەوە و بیدا لە سەرت، ئەوا بە شێوەیەکی ڕۆمانسی ژەهراوی دەبیت.

ئەگەر بڵێن: "من چی لەم درەختە ژەهراوییە بکەم؟ با بیبـڕم و بیسووتێنم هیچ نەبێت!" پێویستە زۆر ئاگادار بـن! چـونکە ئەو دوکەڵەی لە کاتی سووتانی درەختەکە دەردەچێت؛ ژەهراوییە.

نـازانم پێویسـت دەکـات باسـی بـکەم، بەڵام ئەو میـوەیەی لەم درەخـتە بەرهەم دێـت هەر ژەهـراوییە! وا پـێ دەچێـت پـێمان بڵێـت: " بەهـای هەنـار و سـێو و هەرمـێ بگـرن، کە وەک هەنگـوین وایە لەسـەر زمـان. سوپاسـگوزاری لیمـۆ و ئەو لقـانەی سـەر زەوییەکـان بـن، کە بـۆنێکی خـۆش دەبەخشـن! ئەگەر خـودا ویسـتی لـێ بـووایە، ئەوا هەمـوو درەختەکانی وەکو من بونیاد دەنا..."

## درەختی سیکۆیا

تـارق ئۆسـلۆ، لەم دنیـایەدا زۆر شـوێن و زۆر شـت هەیە کە دەیەوێـت بە چاوەکـانی ببینێـت. جـارێ زۆربەی نەبینیـووە، ڕەنگە بە درێژایی ژیانی نەیانبینێـت...بـۆ نمـوونە، بیابانەکـانی کالاهـاری (لە باشـووری ڕۆژئـاوای ئەفریقـا) و لیتـاوی ئۆکاڤانگۆ... دواتر بەرزاییەکانی چیای ئەڤەرێست (من کاتێـک

لە بەرزاییەوە سەیری خوارەوە دەکەم، دەترسم!)، گردە زەردەکانی چین، چیای ڕۆرایما لە فەنزوێلا و مرواریيە بریقەدارە شینەکانی دورگەی بۆرا؛ لەسەر دەریای هێمن...



زۆر زیاتریش هەیە... وا هەست دەکەم دەمەوێت هەموو دنیا ببینم! بەڵام یەکێک لەو شوێنانەی زۆر حەز بە بینینی دەکەم، بریتییە لە باخچەی ڕێدود ( redwood national park) لە باکووری ئەمریکا. واتا ئەو شوێنەی درەختی سیکۆیای لێ دەژی!

سیکۆیا نەهەنگی هەموو درەختەکانی جیهانە، تەمەندرێژترین بوونەوەرە و دەتوانن بۆ ماوەی سێ هەزار ساڵ بژین. توێکڵە بۆنخۆشەکەی نیو مەتر ئەستوورە و درەختەکە لە مێروو و مەگەزەکان دەپارێزێت. هەروەها لە کاتی کەوتنەوەی ئاگر لە دارستانەکاندا دەتوانن بە سەلامەتی لێی دەربچن، چونکە گڕ ناگرن. باڵایان زیاد لە سەد مەتر دەبێت...

#ماڵێك له درەخت



مرۆڤەکان لەنێوانی درەختەکاندا ماڵ دروست دەکەن، بۆ زۆربەی گیاندارەکانیش درەخت هەر خۆی ماڵە. لەویَ لەدایک دەبن و گەورە دەبن. یان هەر لەناو هەمان درەختدا دەژین، یاخود لەم درەخت بۆ ئەو درەخت دەڕۆن؛ دەڕۆنە سەر لووتکەی درەختەکان...

درەختێک، درەختێکی بەرز وەکو باڵەخانەیەک وایە، لە هەر نهۆمێکی چەندەها جۆر گیانلەبەری لەسەر دەژی...

هەندێک لەو گیاندارانەی لەسەر درەختەکان دەژین، وەکو کێچی ناو تووکی سەگ وان، کە مشەخۆرن و زیان بە درەختەکە دەگەیەنن. ئاژەڵەکانی وەک چۆلەکەکان، سمۆرەکان و کوالاکان ئەو ئاژەڵانەن لەسەر درەختەکان ماڵ بۆ خۆیان دروست دەکەن، وەکو هەموو خاوەنی ماڵەکان گرنگی بە ماڵەکانیان دەدەن.



# چۆلەکەکان و درەختەکان

ژیـانی ئەم سـەر زەمیـنە بە جـۆرێکە هەمـوو زینـدەوەران - ئەگەرچی لە جۆری زۆر جیـاوازیش بـن- مانەوەیـان بەنـدە بە یەکترییەوە. لەم جۆرە پـێکەوە وابەسـتەبوونەدا، هەنـدێک جـار لایەنێك سوودمەند دەبێت، بەڵام لایەنەکەی تـر نە سـوودمەند دەبێت و نە زیانیشی پێ دەگـات. بـۆ نمـوونە، ئەو زینـدەوەرە بچووکانەی لە دەوری ئاژەڵە گەورەکاندا دێن و دەڕۆن، لەسـەر پاشـماوەی خـۆراکی ئەو ئـاژەڵ و گەورانە دەژیـن. بەمەش ئاژەڵەکە نە سوود، نە زیانی پێ ناگات.

نموونەیەکی تـری ئەو ئـاژەڵانەی پـێکەوە دەژیـن، لایەنێـک سوودمەند دەبێت و لایەنەکەی تر زەرەرمەند دەبێت.

کێچ و گەنە و ئەسپێکان بەو جۆرەن! خۆیان دەگەیەنن بەنـاو قژی گیانەوەرەکان و بە مژینی خوێنەکانیـان دەژیـن. بەڵام ئەمە هیچ سوودێکی بۆ گیانەوەرەکە نییە، بەڵکو زیانیشی هەیە.

سـێیەم جـۆر لەو ئـاژەڵانەی بەیەکەوە ژیـان دەکەن، هەردوو لایەنەکە سوود بەیەکتر دەگەیەنن. ئەمە هاوڕێییەتی و هاوکاری و پشتگیرییە. هەردوو لایەن بڕوایان بەمە هەیە و دەڵێن: " ئـێمە لەبەر یەکتری بەدیهێنراوین."

لە دنیـــادا زۆر نمـــوونەی لەم جـــۆرە هـــاوڕێیەتییە هەیە. هـاوڕێیەتی نێـوان درەخـت و باڵنـدەکان تەنهـا نمـوونەیەکە لەوانە...

...

ئەگەر توانـای فڕینتـان هەبێـت، ئەوا چەنـد بەرز ببیـتەوە لەو شوێنەی دانیشتووی هیچ گرنگییەکی نابێت، بەڵکو چەنـد بەرز ببیتەوە ئەوەندە باشترە.

لـق و بۆشـایی قەدی درەخـتە بەرزەکـان، حەشـارگەیەکی سەرنجڕاکێشـە بـۆ باڵنـدەکان. هەم بـۆ خۆیـان، هەمـیش بـۆ هێلکەکانیـان و زەڕنەقوتەکانیـان، کە توانـای فڕینیـان نیـیە.

هەروەهاماڵێکی گونجاوە بۆ خۆپاراستن لە ڕاوچییەکـان کە لە ناوچەکاندا بۆ ڕاوکردنی نێچیرەکان دەگەڕێن.

جـــگە لەوەش هەنـــدێک لە درەختەکـــان بەهـــۆی میـــوە شـــیرینەکانیانەوە ســـوود بە باڵنـــدەکان دەگەیەنـــن و ئەرکـــی دۆزینەوە و دەستخستنی خواردنیان لەسەر لا دەبەن.

بەتایبەت لقی درەختەکان، گەڵاکان، دەروازەی نێوان توێکڵی درەختەکـــان و تەنـــانەت مێرووەکـــان و هێلکەکانیشـــیان دەوڵەمەندن لە پرۆتین بۆ باڵندەکان. باڵندەکان بـێ ئەرککێشـان ئەوانە کۆ دەکەنەوە و هەم شـوێنێک بـۆ خۆیـان دابـین دەکەن، هەمیش بەچکەکانیان بەخێو دەکەن.

هەر بۆیە ئەمە چەند سوودی بۆ باڵندەکان هەبێت، بە هەمـان شـێوەش سـوودی بـۆ درەختەکـان هەیە. چـونکە ئەو مێـرووە بچووکانە زۆربەی کات زیان بە درەختەکان دەگەیەنـن و جـگە لە دەنووکی باڵندە زیرەکەکان، هیچ شتێکی تر درەختەکان ئـاوا باش لە مێرووەکان پاک ناکاتەوە. هاوەڵێتی نێـوان باڵنـدەکان و درەختەکان هەر ئەوەندە نییە. باڵندەکان لەگەڵ میوەکاندا تۆوی میوەکـانیش دەخـۆن و ئەو تـۆوانەش لە سیسـتمی هەرسـی باڵندەکانـدا هەرس نـاکرێن، لەبەر ئەوە هەر بەو جـۆرە فڕێـی دەدەنەوە.

بەتایبەت ئەو درەختانەی تـۆوی زۆر بچـووکی میـوەی هەیە؛ وەکو هەنجیر، بەو شێوەیە بە ئاسانی بەرەو دوور بڵاو دەبنەوە.

هەندێک لە باڵندەکانی وەکو قەلەڕەش، خاوەنی دەنـووکێکن توانـای کـردنەوەی قوچەکیـان هەیە، بەتـایبەت لە درەختـی دارکاژەکان. تۆوی ناو قوچەکەکان دەردەهێـنن. ئەو تـۆوانەش تەنها بۆ ئەو دەنووکانە گونجاوە.

قەلەڕەشەکان لە هاویندا ئامـادە باشـی دەکەن بـۆ زسـتان، بە ناشـتنی ئەو تـۆوانەی کۆیـان کـردووەتەوە. هەر بـۆیە یەک قەلەڕەش هەزارەها تۆو دەنێژێت.

کاتێـک دەبێـت بە زسـتان، تەنهـا کەمێـك لە تۆوەکانیـان دەدۆزنەوە و دەریدەهێنن. زۆربەی یان پێویستیان پێـی نابێـت، یاخود هەر لە مێژەوە شوێنەکەیان لە یـاد کـردووە. ڕەنـگە بڵـێن ئەی باشە ئەوەی لە ژێـر زەویـیەکە مـاوەتەوە چـی لـێ دێـت؟ ئەوانەش دەبن بە درەخت.

لەنێـوان سـمۆرەکان و درەختەکانیشـدا نمـوونەیەک لەو یارمەتیدانە هەیە. سمۆرەکان لە بۆشـایی درەختەکانـدا مـاڵ بـۆ خۆیان دروسـت دەکەن و شـەیدای تـۆوە ڕەقەکـانی درەختـی گوێز و بوندوق و بەڕوون.

لەبەر ئەوە هەر وەکو قەلەڕەشەکان هاوینیان بە ناشـتنی ئەوانە بەسەر دەبەن. ئامانجی سەرەکییان ئەوەیە بۆ زستان برسی نەبن.

بەڵام زۆربەیان لە یادیان دەچێن لەکوێدا ناشتوویانە و هەر بۆیە ئەو تۆوانەش دەبنەوە بە درەخت.

کاتێک لە نێوان لقی درەختەکانـدا و لە گۆشـە بچووکەکانـدا بەچکەی نوێی سمۆرەکان لە دایک دەبن، ئەوا لە دارستانەکاندا ئەو تۆوی گـوێز و بونـدوق و بەڕووەی لەلایەن سـمۆرەکانەوە نێژرابوون و لەبیر کرابوون، دووبارە سەوز دەبنەوە...

ئەمەش بۆ سەدەها و هەزارەها ساڵە بەردەوامە.

درەختەکان، باڵندەکان و سمۆرەکان شان بە شانی یەک ژیـان دەکەن و دەڕۆن...

## کوالا خەواڵووەکان و درەختی یۆکالیپتۆس

بۆ کوالایەک، درەختی یۆکـالیپتۆس مـاڵێکە. لە ڕاسـتیدا زۆر زیاترە... دەڵێی درەختی یۆکالیپتۆس تەنها بۆ کوالاکـان بونیـاد نراوە، لە کاتێکدا گەڵای درەختەکە بۆ ئاژەڵەکانی تر ژەهراوییە. سیسـتمی هەرسـی کوالاکـان بەئاسـانی ئەو گەڵا ژەهراویـانە هەرس دەکـــات. هەر کـــوالایەک ڕۆژی یەک کیلـــۆ گەڵا دەخوات، بەمەش هەم تێر دەبێت، هەمیش پێویستی ئاوی بۆ پڕ

دەبێتەوە و هەندێک جار بە مانگ پێویستی نییە لە درەختەکان بێتە خوارەوە.

کوالاکان ئەوەندە ماڵەکانیان خۆش دەوێت، تەواوی ڕۆژەکەیان بە باوەشکردن بە درەختی یۆکالیپتۆس بەسەر دەبەن.

ئەمە لە خۆشەویستییاندا نییە بۆ ماڵەکەیان. زاناکان دوای تاقیکردنەوە بە کامێرا هەستیارەکانیان، گەیشتنە ئەنجامی ئەوەی کوالاکان بۆ فێنکبوونەوە لە گەرمادا، ئاوا باوەش دەکەن بە لقی درەختەکاندا. چونکە ئەگەر هەوای دەرەوە ٤٠ پلە بێت، ئەوا درەختی یۆکالیپتۆس ٣٣ پلە دەبێت!



# ئاژەڵە تەمەڵەکان

ڕێک وەک کوالاکان، ئەو ئاژەڵانەی تریش کە لەسەر لقەکـان نایەنە خوارەوە؛ ئاژەڵی تەمەڵن.

لە باشوور و ناوەڕاستی ئەمریکا، ئاژەڵە تەمبەڵەکان بۆیە پێیان دەوترێـت تەمـبەڵ چـونکە بە خـاوی دەجـووڵێنەوە. بە واتـای ئەوەی ئەگەر بەیـــانی ئـــاژەڵێکی تەمـــبەڵ بنێریـــت بـــۆ سـەموونخانەیەک، ئەوا دەبێـت تـا ئێـوارە چـاوەڕێ بکەیـت. ئەویش بۆ گەڕانەوەی نا، بەڵکو بۆ ڕۆیشتنەکەی!

ئەگەر ئاژەڵێک لە مانگەکەدا جارێک لەسەر درەختەکان بێـتە خوارەوە بۆ تەوالێت -ئەویـش ئەگەر پێویسـتی بێـت-، جـا بـۆ هێنانی سەموون دەچێت بۆ سەموونخانە؟ هەرگیز ناچێت!

ئـاژەڵە تەمبەڵەکـان بە درێژایـی ڕۆژەکەیـان لە نێـوان لقـی درەختەکانـــدا دەخەون و لە کـــاتی برسێتیشــــدا بە گەڵای درەختەکان خۆیان تێر دەکەن. درەختەکان شوێنێکی پـارێزراون بۆ ئەو ئاژەڵانەی ئاوا بە ئەستەم جووڵە دەکەن...

# درەختە مردووەکانی ناو دارستانەکان

لە ڕووی تەکنیکییەوە، ئەو ماڵانەی لەلایەن مرۆڤەکانەوە لە درەختەکان دروست دەکرێن، ماڵێکن لە درەختە مردووەکان دروست کراون. بەڵام لە دارستانەکاندا ئەو درەختانەی بە هەر هۆکارێک بێت وشک بوون و مردوون، هێشتا نیعمەتێکی بێئەندازەیە بۆ ئاژەڵەکان و بەتایبەت ماڵێکی ڕازاوەیە!

هەر لە سەرەتاوە مێرووولە سوورەکانی دارستان ئەو درەختە گەورە مردووانە فەرامۆش ناکەن. جگە لە مێرووولەکانیش، هەتا ڕۆژی دوایی جۆرە جیاوازەکانی پەپوولە نیشتەجێبوون لەسەر درەختە مردووەکان هەڵدەبژێرن.

چۆلەکەکانیش لە گۆشەی درەختە مردووەکان ماڵەکانیان دروست دەکەن؛ بێ ئەوەی ببینرێن. باڵندەی دارکونکەرەکانیش سەر ڕووی درەختەکان کون کون دەکەن.

درەختە مردووەکان بە واتای ماڵێکی جوان دێت بۆ مشکی دارستان و ژیشکەکان و کەروێشک و تەنانەت ڕێوییەکانیش، کە بتوانن پشووی تێدا بدەن.

درەختە مردووەکان تەنها بۆ ئاژەڵەکان نا، بەڵکو بۆ قارچک و ڕووەکە جۆراوجۆرەکانی ناو دارستانەکانیش ژیانکردن لەسەر

ئەو درەختانە، وەکـو ژیـانکردنە لە مـاڵێکی جـوان کە هـاوینی فێنکە و زستانیشی گەرمە...

لێرەدا پێویستە باسی ئەوە بکەیـن درەخـتە مردووەکـان چەنـد گرنگن بۆ مرۆڤەکان، بەڵام ئێوە ئەوە دەزانـن. بـۆ نمـوونە، ئەو پەرتووکەی دەستتان، ڕەنگە ڕۆژێک درەختێکـی سـوورەچناری قەشەنگ و درێژ بووبێت و گەڵاکانی پرۆسەی ڕۆشنەپێکهاتنی ئەنجـام دابێـت. ڕۆژانێـک شـنەبا شـیرینەکان لقەکـانی جوڵاندبێتەوە؛ کە چۆلەکەکان گۆرانیان لەسـەر دەوت، یـاخود قەلەڕەشە پیرە گاڵتەئامێزەکان تفیان گرتبێتە هەر کەسێک بە ژێـر درەختەکەدا ڕۆیشتبێت. ئێستا بـووە بە پەرتووکێـک، بەتـایبەت پەرتووکێک کە دەربارەی درەختەکانە...



# بیرکارییە، ڕێکەوت نییە!

ئەگەر ٤٠٠ قوتابی هەموو بەیانییەک لە باخچەی هەمان قوتابخانەدا کۆ ببنەوە ، ئەوا ڕێکەوت نییە...

ئەگەر ئەو ٤٠٠ قوتابییە ببنە ٢٠ گرووپ و هەر گرووپێك ٢٠ قوتابی لەخۆ بگرێت و لە هەمان شوێنی باخچەکەدا دوو ڕیز دروست بکەن، ئەوا هەر ڕێکەوت نییە...

ئەگەر هەر کەسێک لەو ٢٠ کەسەی ٢٠ گرووپیان پێک هێناوە بەسەر ٢٠ پۆلدا دابەش ببن و هەر یەکێکیان خاوەنی پۆلێک بێت و بڕواتە ژوورەوە، ئەوەش هەر ڕێکەوت نییە.

ڕێکەوت نییە ئەگەر هەر قوتابییەک لەو ٢٠ قوتابییە بەیانیان لە ١٠ ڕیزدا لە ڕیزێک دابنیشێت و هەر ڕیزێکیش دوو قوتابی لەخۆ بگرێت و بە تایبەت هەر یەکێک ڕیزەکەی و هاوڕێکەی نەگۆڕدرێت.

ئەگەر من وەک بێگانەیەک لە دنیایەکی ترەوە بهاتمایەتە سەر ئەم دنیا سەیروسەمەرەیە و لە هەر قوتابخانەیەک بەیانیان ئەم کارە نامۆیەم ببینیبایە، ئەوا دەموت: "ئەم بەیانییە وا بوو، بەڵام با بزانم بۆ سبەی بەیانی چۆن دەبێت."

بۆ ڕۆژی دواتر، ئەگەر بمبینیبایە کە ئەو ٤٠٠ قوتابییە بە هەمان شێوەی ڕۆژی پێشوو لە باخچەکەدا کۆ دەبوونەوە و

دەچوونە ڕیزەکانەوە، دواتر بەسەر پۆلەکان و بەسەر ڕیزەکانـدا دابەش دەبوون، ئەوا دەموت: "بە دڵنیـایەوە لەم کـارەدا شـتێک هەیە!"

"لێرەدا هیچ شتێک وەکو ئەوە نییە کە دەیبینی..."

بەڵام باشـتر وایە بـۆ دڵنیـابوونەوە تـا ڕۆژی سـێیەمیش چـاوەڕێ بـکەم، ئەو ڕووداوانەی لە ڕۆژی دووەمـدا بینـیم پـاش ئەوەی لە ڕۆژی سێەمیشـدا دووبـارە دەبـووەوە؛ ئەوا تێدەگەیشـتم کە ئەمـانە بە ڕێـکەوت نیـیە، بەدڵنیـاییەوە ئەگەر بێگانەیەکی گەمژە نەبم.

بە خـۆمم دەوت: "نە بە ڕێـکەوتە، نە بە بەخـتە، نە خـۆی ڕووی داوە." نەخێـر نەخێـر! هەمـوو ئەو کـارانە بەدڵنیـاییەوە بە پـلان و پرۆگـرام دانـراوە. کـێ دەچێـتە چ قوتابخـانەیەک، دەچێـتە چ ڕیـزێکەوە، سـەر بە کـام پـۆلەیە و لەگەڵ کێـدا و لە کـام ڕیـز دادەنیشـن هەمـووی زانـراوە! لێـرە هەمـوو شـتێک پێـوانە کـراوە و گرنگـی پـێ دراوە. لە هەر شـوێنێکیش شـتەکان دانە دانە پێـوانە کرابێـت ئەوا ڕێـکەوت ڕوو نادات!

# لقی درەختەکان و پەلی لقەکان

لە منداڵییەوە ئاشنا بـووم بە زۆرێـک لە درەختەکـان. بەسـەر درەختی سێو و درەختـی تـوو و درەختـی گـێلاس و درەختـی هەنجیـردا سـەرکەوتووم. هەر بە سـەرکەوتن بەسـەر درەختـی هەنجیـردا نەوەسـتاوم، بەڵکـو لەسەریشـی کەوتـوومەتە خوارەوە...

بە تێپەڕبوونی کـات تێگەیشـتم هەمـوو درەختێکـی هەمیشـە سـەوز و گەڵا دەرزی ئاسـا درەختـی سـنەوبەر نیـیە، بەڵکـو تێگەیشـتم هەنـدێکیان پێیـان دەوترێـت کـاژی (spruce)، هەندێکیان پەلک و هەندێکی کەیان دارئاسمانی. لە کاتێکدا کە ئەمانە ئەندامی یەک خێزانی ئەو درەختەن.

بەخۆشـحاڵییەوە، لە منـداڵییەوە دەزانـم درەختـی هەنـار لە زسـتاندا گـوڵێکی سـوور دەردەکـات و تـا وەرزی پـایز دەدرەوشێتەوە، درەختـی بـادەمیش لقێکـی درەوشـاوەی پـڕ لە گوڵی جوانمان پێشکەش دەکات، کە مرۆڤ سەرسام دەکات..

درەختەکانم خـۆش دەویسـت، زۆریـش خۆشـم دەویسـتن. وەرزەکانم لە ساڵنامەکان نا، بەڵکو لە درەختەکـانەوە دەزانـی و هەر کاتێکیش درەختێکی تـازەم بناسـیایە، ئەوا لە ژێـر سـێبەرە فێنکەکەیدا دەوەستام و هەوڵم دەدا لقەکانی بژمێرم.

ئەگەر نەشـمتوانیایە لقـی درەخـتەکە بژمێـرم، ئەوا هەر هـیچ نەبێت بە چاوگێڕان بەناو لقەکاندا بە نزیکەیی هەژمارم دەکردن. ئەوەش خولیایەکی من بوو.

لقە دڕکاوییە خۆشەویستەکانی تووترك، لیمۆ بۆن خۆشەکان، سنەوبەرە زەبەلاحەکان، درەختە باڵا کورتەکانی سێو و هەرمێ؛




سەرنجم دا لە بەخشندەیی خودا بۆ سەر زەویـی بەرانـبەر ئەو بێ فەرمـانییەی دەکرێـت، بەڵام هەرگیـز دەسـتی بەخشـندەیی نەگێـڕاوەتەوە. تەنهـا لە وەرزی زسـتان و هاویـنـدا گەڵای درەختەکـان نادرەوشـێنەوە و میوەکـان بە گـوڵ نـاڕازێنرێنەوە، بەڵکـو سـەرنجم دا هەر چـوار وەرزی سـاڵ ئەمە ڕوو دەدات.

هەمیشە دەمویست بزانم ئەو لقانەی لە قەدە ئەستوورەکەوە دەرچوون چەندن، ئەوانیش چەند پەلیان لێ بووەتەوە...

مرۆڤ بۆچی لقی درەختێک دەژمێرێت؟ من لەبەر ئەوەی مەراقم بوو دەمژمارد، بەڵام نازانم ڕووەکزانەکانی سەدەی نۆزدەیەم بۆچی دەیانژمارد. ئەوەی دەیزانم ئەوەیە دەکرێت ڕووبەڕووی ڕووداوێکی سەیر بووبێتنەوە کە هیچ چاوەڕێیان نەکردبێت، یاخود پێشبینیان نەکردبێت.

ئەو لقەی بۆ یەکەم جار لە درەختێکەوە دەردەچێت، یەکەمجار دوای دوو ساڵ ئینجا لقێکی نوێی لێ دەبێتەوە، دوای ئەوە هەموو ساڵی جارێك لقێکی نوێی لێ دەردەچێت.

بەدڵنیاییەوە ئەو لقە نوێیەی دەرچووە، دوای دوو ساڵ لقی نوێ دەردەکاتەوە و بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت.

لە پەڕەی دواتردا ئەو خشتەیە دەکرێت هەر درەختێک بێت، بۆ نموونە: "درەختی کەستانەی گوڵی سپی، یاخود دەکرێت گوڵی نینۆکە هێستر (gorse) بێت."

ئێستا با سەرنجی ژمارەی ئەو لقانە بدەین کە هەر ساڵێک زیاد بووە:

ساڵی یەکەم: ١
ساڵی دووەم، بە هەمان شێوە: ١
ساڵی سێیەم: ٢
ساڵی چوارەم: ٣
ساڵی پێنجەم: ٥
ساڵی شەشەم: ٨
ساڵی حەوتەم: ١٣
ساڵی هەشتەم: ٢١
ساڵی نۆیەم: ٣٤
ساڵی دەیەم: ٥٥

١، ١، ٢، ٣، ٥، ٨، ١٣، ٢١، ٣٤، ٥٥.

ئەمانە ژمارەی فیبانۆچین(Fibonacci)[١] هەر ژمارەیەک بریتییە لە کـۆکراوەی دوو ژمـارەی پـێش خـۆی. لە گەردوونـدا هەر درەختێک یاخود ڕووەکێک کە گەشە دەکات، بە ڕیزبەندی ئەم ژمارانە لقەکانی دەردەچێت.

واتا لقی درەختەکـان و پەلـی لقەکـان، بە ڕێـکەوت هەر بـۆ خۆیان گەورە نابن و دەربچـن. هەر دانەیەکیـان هەژمـاری بـۆ کراوە لە کوێ دەردەچێت و لە چی کاتێکیشدا دەردەچێت.

---

١ - بۆ زانیاری زیاتر سەیری کتێبی بیرکاری تارق ئۆسلۆ بـکەن بە نـاوی "لێکی بدەن تا لێکم نەداون" هەر خۆی نووسـینەکانی ئەم بەشـەم لەوێـوە وەرگرتووە! ئەگەر دزیبێتیشم لە کتێبەکەی خۆمم دزیووە.

# ژمارەی گەڵاکان

ئەگەر لە دوورەوە و هەر ئاوا بەبێ سەرنج تەماشای گەڵای درەختەکان بکەین، ئەوا دەبینین وەک بیبەری ڕەش وان بەسەر قاپێک برنجەوە. هەزارەها گەڵا بە هەڕەمەکی، وەک ئەوە وایە لقەکانیان پێچابێتەوە.

- ئەی باشە ئاوایە؟

ئاخۆ ئەو لقانەی زانراون لە چ کاتێک و لە چ شوێنێکدا دێنە دەرەوە، تۆ بڵێی گەڵاکانیان نەزانن لە چ کاتێک و لە چ شوێنێکدا بێنە دەرەوە؟

"گەڵایەک بەرنابێتەوە کە خودای گەورە ئاگادار نەبێت لێی و زانیاری نەبێت پێی..." (الأنعام: ٥٩)

باشـــه ئەو گەڵایەی بەبـــێ مـــۆڵەت و زانیـــاریی خـــودا هەڵنەوەرێت، ئەی باشە بەبێ ئەوەی خودا مۆڵەت بـدات دێـتە دەرەوە؟

مەگەر دەکرێـت بە ڕێـکەوت گەڵای درەختـی ئـسفەندانی، ماگنۆلیا، ترێی لینجی، یاخود درەختی کورتەباڵای شاتووی پیر -کە بـۆنێکی تیـژی هەیە- بەتـایبەت کە هـیچ هەژمـاری بـۆ نەکرابێت سەوز ببێت؟ یاخود خونچەیەک، یان گوڵێک، یاخود میوەیەک؟

بۆ داربڕەکـان دوو جـۆر ڕووەک هەیە ؛ ئەوانەی دەسـووتێن، یاخود ئەوانەی بەزەحمەت دەسووتێن. بۆ منداڵەکانیش دابەش دەبێت بۆ دوو گرووپ؛ ئەو ڕووەکانەی میوەی بەتـامی هەیە و ئەوانەی نیانە.

خانمەکـانیش چـونکە زۆر کـات لەگەڵ گوڵەکانـدا بەسـەر دەبەن، بۆ ئەوان گوڵەکان بەسەر سـێ گرووپـدا دابەش دەبـن: (بـۆنی خـۆش، بـێ بـۆن، بـۆنێکی نـاخۆش). بەدڵنیاییشـەوە دەگونجێـت لە دڵیانـدا شـوێنێکیش بـۆ گرووپـی چـوارەم بدۆزنەوە: (بۆنی خۆش نەبێت، بەڵام شێوەی جوان بێت).

ڕووەکناسەکانیش ڕووەکەکانیان بەپێـی جـۆرە جیاوازەکانیـان بەسەر چەنـد پۆلێکـدا پـۆلێن کـردووە: (تـۆو کراوەکـان، تـۆو

داخراوەکـــان، گەڵا پانەکـــان، شـــێوە قوچەکییەکـــان، تـــاك توخمەکان و فرە توخمەکان و گوڵەکان... هتد).

یەکێک لە تایبەتمەندییەکان کە ڕووەکناسەکان سـەرنجیان دا، لە کاتی پۆلێنکردندا ڕێکخستنی سەر گەڵای ڕووەکەکان بـوو؛ واتا (phyllotaxis). چونکە هەموو جۆرێکی ڕووەک جۆرێک لە ڕێکخســـتی گەڵای تـــایبەت بە خـــۆی هەیە. هەمـــوو ئەو ڕیزبەندی گەڵایـانە هەڕەمەکـی نـین، بەڵکـو بەپێـی یاسـایەک زانراون...

گەڵای ڕووەکەکان وەکـو فـارغۆنی شـەمەندەفەر ڕیزبەنـدی نەکراون. بەڵکو گەڵاکان لە دووری چەند خاڵێـک لە خـوارەوە بۆ سەرەوە دەوری لقەکانیان داوە (وەکو شێوەی حەلەزۆنـی) و نـاکەونە سـەر یەک. بەمەش هـیچ گەڵایەک بەری ڕوونـاکی گەڵاکەی تر ناگرێت.

ئەگەر پەتێـک لە لاسـکی نـزمترین گەڵا ببەسـتین و درێـژی بکەینەوە بۆ بەرزتـرین گەڵا، ئەگەر ئەو پەتە لە لاسـکی گەڵای خـوارەوەدا بـۆ لاسـکی گەڵای سـەرەوە بـڕوات، ئەوا وەکـو لاولاوێك دەردەکەوێت بە دەوری لقەکەدا.

ژمارەکان لە ڕووەکێکەوە بۆ ڕووەکێکی تـر دەگۆڕێـت، بەڵام ژمارەی گەڵاکانی نێـوان یەکەم گەڵا و گەڵای سـەرەوە یـاخود خوارەوە لە یەک ئاڕاستەدا، ئەوا ژمـارەی فیبـانۆچیە! بەتـایبەت

ژمارەی ئەو لۆچانەی بە دەوری لقەکاندا ئاڵاندوومانە هەر ژمارەی فیبانۆچینە!

بۆ نموونە، با لقی درەختێکی سێو بهێنن بە هەڕەمەکی گەڵایەکی لێ هەڵبژێرن. دەست لەسەر ئەو گەڵایە ڕابگرن و لە هەمان لقدا بگەڕێین بەدوای گەڵایەك کە لەسەر هەمان ئاڕاستەی ئەو گەڵایەی خۆمان سەری دەرهێنابێت، ئەگەر لەسەروو گەڵای خۆمانەوە یان لە خوارووییەوە بێت، هەر دەبێت دوو سووڕ لێ بدەین بەدەوری لقەکەدا تا دەگەینە ئەو گەڵایە. لەو نێوەندەشدا (٥) گەڵا دەکەونە نێوانیانەوە. بەمەش ڕێژەی گەڵاکانی سێو (٥/٢)ە، واتە لە نێوان ٢ گەڵای سەر هەمان ئاڕاستە ٥ گەڵایان لە نێواندایە.

ئەو لقەی گەڵاکانیمان ژمارد، ئەگەر لە بری درەختی سێو درەختی شۆڕەبی بوایە؛ ڕێژەکەی ١٣/٥ دەبوو.

واتا بۆ ئەوەی بگەین بە هەر گەڵایەک لە لقی درەختی شۆڕەبی و گەڵایەکی تر کە لەسەر هەمان هێڵ بێت، ئەوا پێویستە ٥ خوول لێ بدەین بە دەوری لقەکەدا و لەم ٥ خوولەشدا بە ١٣ گەڵادا تێپەڕ ببین. وەک ئەوەی لە خواریشەوە بینیتان، هەموو ئەو ژمارە و ڕێژەیانە بۆ ژمارەکانی فیبانۆچی دەگەڕێنەوە!

١، ١، ٢، ٣، ٥، ٨، ١٣، ٢١...

ئەگەر من بێگانەیەک بوومایە و لە دنیایەکی ترەوە هاتبامـایەتە سـەر ئەم زەویـیە؛ ببیـنم گەڵا و لقەکـانی درەختێکـی سـێو لە ئاماسیا تا تۆکیۆ و هەموو گەردوون یەک هەژماریان بۆ کـراوە، ئەوا دەوەستام و دەموت: "بەدڵنیاییەوە ئەم کارە شتێکی تێدایە!"

" لێرە هیچ شتێک وەک ئەوە نییە کە دەیبینی! نە ڕێکەوتە و نە بەختە و نە خۆڕسکە! نەخێر نەخێـر! هەمـوو ئەو کـارانە بەبـێ گومان پلان بۆ داڕێژراو و بە پرۆگرامە.

ئەو لقانە بۆ خۆیان بە هەژمار کراوی دەرناچن، ئەو گەڵایـانە نە بە ڕێکەوت، نە بە بەخت ئاوا هەڕەمەکی لەسەر لقەکان ڕیـز نابن! هەموو شتێک لە شوێنێکەوە هەژماری بۆ کـراوە، چـونکە هیچ شتێک بە ڕێکەوت نابێت.



# دەتەوێت باوەڕ بکە، یان مەیکە

- لەبەر ئەوەی مرۆڤەکان پێویستیان بە کلینێکسی تەوالێت هەیە، ئەوا هەموو ڕۆژێک ٢٧٠٠٠ درەخت دەبڕێتەوە.

- منداڵێک کە دایبی بەکار دەهێنێت، ئەو دایبییانەی بەکاری دەهێنێت تا ئەو ڕۆژەی فێری چوون بۆ تەوالێت دەبێت؛ دەبێتە هۆی لەناوبردنی ٢٥ درەخت.

- هەر شتێک پێویست بێت بۆ گەشەکردنی درەختێک -جگە لەو (١٠٪)یەی لە خاکەکەوە وەریدەگرێت- هەمووی لە بەرگەهەواوە وەردەگرێت.
- ئەگەر ئەمە بە پێچەوانەوە بووایە، ئەوا لەسەر ڕووی زەوی خۆڵ و گڵ نەدەما.
- بە گشتی لە هەر درەختێک دەتوانرێت ٧٠,٠٠٠ قەڵەم ڕەساس دروست بکرێت.
- ئەگەر لە ماڵێکدا بژین بە درەخت چواردەوری درابێت، ئەوا ئەو وزەیەی بۆ بەکارهێنانی فێنککەرەوە لە وەرزی هاویندا بەکاری دەهێنن؛ بە نیو هێندە کەم دەبێتەوە!

- ١٠٠٠ مەتر چوارگۆشەی ناوچەیەکی پڕ لە درەخت لە توانایدایە دوانە ئۆکسیدی کاربۆن هەڵبمژێت، کە لە بۆری دووکەڵی ئۆتۆمبێلەکانەوە دێنە دەرەوە؛ کە ئۆتۆمبێلێک بە درێژایی ١٠,٠٠٠ کیلۆمەتر ڕۆیشتبێت!

- ئەگەر لە شـــارێکی پـــڕ لە درەختـــدا بــژین، ئەوا ڕێـــژەی تووشبوونتان بە شێرپەنجەی پێست کەمـترە لە شـاری بـێ درەخت. چونکە درەختەکان مرۆڤەکـان لە هەر تیشـکێکی زیـــانبەخش دەپـــارێزن کە لە خـــۆرەوە پـــێمان دەگـــات. کاریگەریی تیشکی UVB (تیشـکی سەرووبنەوشـەیی) بە نیواونیو کەم دەکاتەوە!

- بەپێـــی لێکۆڵینەوەکـــان، ئەو نەخۆشـــانەی لە پەنـــجەرەی نەخۆشخانەکانەوە درەختەکان دەبینن زووتر چاک دەبنەوە، بە بەراورد بەو نەخۆشانەی درەختیان لێوە دیار نییە!

- لە ٤٠٠٠ مەتر چوارگۆشەی پڕ لە درەختدا، بەشی نزیکـی ٢٠ کەس ئۆکسجین بەرهەم دەهێنرێت!

- لە ئێســتادا زیــاتر لە ٣ ترلیــۆن درەخــت بــوونی هەیە! هەر کەسێک ٤٢٢ درەختی بەردەکەوێت! ئامەمان گرنگی بدەن بە درەختەکانتـــان، چـــونکە ئەم ڕێـــژەیە ســـاڵانە بەرەو کەم بوونەوە دەچێـت... هەمـوو سـاڵێک ١٥ ملیـۆن درەخـت دەبڕێتەوە.

- یەک لە پێنجـــــی ئۆکســـــجینی زەوی لە دارســـــتانەکانی ئەمازۆنەوە بەرهەم دەهێنرێت.




- بە هەمــوو دارســتانەکانی دنیــا، ســاڵانە ٢,٥ ملیــار تەن دوانەئۆکسیدی کاربۆن لە هەوادا پاک دەکرێتەوە!
- درەختــی ئاکاســیای هەمیشــە بڵنــد، مــاڵی جۆرێــک لە مێرووڵەکــانە. مێرووڵەکــانی ســەر ئەم درەخــتە لەنــاو دڕکە باریکە ناو بۆشەکانیدا دەژیــن و گەزۆ زەردە بچووکەکــانی سەر گەڵاکانیش دەخۆن. لە بەرانبەر ئەمەشدا بە ئاگــاییەوە درەختەکە لە هەر مێروو و مەگەزێکی زیانبەخش دەپارێزن.
- ئیــتر کــاتی ئەوە نەمــاوە دووبــارە بە بەکارهێنــانەوەی کاغەزەکان پشتگوێ بخرێت. ئەگەر بتوانین ئەو کــاغەزەی بەکــاری دەهێنــین نیــوەی بەدەســت بخەیــنەوە، ئەوا لە وڵاتەکەمانــدا نــاوچەی دارســتانەکان لە درەخــت بــڕینەوە دەپارێزین!

- لە دنیـــادا بەتەمەنـــترین درەختـــی کەوانـــی لە چیاکـــانی زۆنگولاك هەیە. ئەم درەخـتە ٤١١٢ سـاڵ تەمەنییەتـی. لە دنیاشدا پێنجەم بەتەمەنترین درەختە. شـارەزایان جەخـت لەوە دەکەنەوە درەختـــی کەوانـــی زیـــاتر لە ٤٠٠٠ ســـاڵ دەتوانێت بژی، ئەگەر بێتـوو نەسـووتێت، نەبـڕدرێتەوە، لە سـەرەوە ڕوونـاکی لێـی نەدات و ڕۆژی قیـامەت بەرپـا نەبێت!
- درەختێـک بە نـاوی هـایپێریۆن (hyperion) لە دارسـتانە سوورەکەی باخچەی نەتەوەیی کالیفۆرنیا- USA لە دنیـادا بە بەرزتـــرین درەخـــت دیـــاری کـــراوە. ئەم درەخـــتە سەرسـوڕهێنەرە درێـژییەکەی ١١٥,٦٢ مەتـر دەبێـت؛ جۆرێکە لە درەختی سنەوبەر.
- هەر لە هەمان باخچەی نەتەوەییدا، درەختێکـی تـر بـوونی هەیە بە نـاوی درەختـی شـێرمان (general Sherman)؛ جۆرێکە لە درەختی سنەوبەر و لە دنیـادا بە زەبەلاحـترین درەخت ناسێنراوە. باڵای ٨٥ مەترە و تیرەی گشتیشـی ٢٥ مەتـرە. ١٥ کەسـی پێگەیشـتوو توانـای ئەوەیـان هەیە لە تەنیشت یەکەوە دەستیان بـکەنەوە و بـاوەش بە قەدەکەیـدا بکەن. ئەم درەختە زەبەلاحە تیرەی توێکڵەکەی دەگاتە نیـو مەتر، ٣٠٠٠ ساڵ تەمەنییەتـی. بەپێـی ئەو ژمێرکارییـانەی بۆی کراوە کێشەکەی دەگاتە ٢٠٣٠ تەن.


تارق
ئۆسلۆ
بۆچی
سەرسوڕهێنەرە؟

# درەختی دەفرە ئیسفنجییەکان

زۆرترین پرسیار لێم دەکرا سەبارەت بە "زنجیرەی بەدیهێنراوە سەرسوڕهێنەرەکان"ی نووسەر تارق ئۆسلۆ کاتێک بەشداری پرۆگرامەکانی خوێندنگاکەم دەکرد، ئەمانە بوون:

"بۆچی ناوی ئەم پەرتووکانە بەدیهێنراوە سەرسوڕهێنەرەکانە..."

بە گشتی بەم شێوەیە وەڵام دەدەمەوە:

"چونکە ئێمە لە نێوان خۆماندا دانیشتین و وتمان پێویستە ناوێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بدۆزینەوە بۆ ئەم پەرتووکانە. بیرمان کردەوە، بیرمان کردەوە، بەڵام دوای ئەوەی هیچ ناوێکی سەرسوڕهێنەر بە مێشکماندا نەهات؛ وتمان با ناوی بنێین بەدیهێنراوە سەرسوڕهێنەرەکان!"

- بەڕاستیتانە؟

-نەخێر بەدڵنیاییەوە! ئەمە تەنها گاڵتەیەکە!

ئەگەر ئەمەش کەمێک ڕاستی تێدابێت هەر وەک چۆن لە هەموو گاڵتەیەکدا هەیە، ئەوا چیرۆکی ڕاستەقینەی ناوی بەدیهێنراوە سەرسوڕهێنەرەکان لە وشەی سەرسوڕهێنەردا خۆی حەشار داوە.

سەرسوڕهێنەر، لە عەرەبیدا لە ڕەگی "عجب" ەوە هاتووە و بە واتای سەرسوڕمان دێت. "عجیبە"ش بە واتای شتێک دێت مرۆڤ تووشی سەرسوڕمان بکات. ئەگەر لە کوردیدا بە شێوەی تاک بەکار بێت، ئەوا سەرسوڕهێنەر بەگشتییە . واتا ئەو شتانەی مرۆڤ تووشی سەرسوڕمان دەکات.

ئەم واتایانەشی هەیە: سەیروسەمەرە، نامۆ، لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا، جیاواز، نائاسایی، بیرهەژێن...

دەتوانین لە بری وشەی سەرسوڕهێنەر، ئەمە زیاد بکەین و وشەکانی سەیر، لەڕادەبەدەر، موعجیزە بە ئاسانی بەکار بهێنین.

ئەگەر لە ئێوە بپرسم: "بە بڕوای ئێوە سەرسوڕهێنەر چییە؟" ئەوا لە خوارەوە بۆ سەرەوە ئەم شتانە دەڵێن...

لە واتای وشەی سەرسوڕهێنەردا هیچ بیرۆکەیەکی جیاواز بەدی ناکەین ...

بەڵام ئەگەر بپرسم: " چ شتێك سەرسوڕهێنەرە؟" ئەوا بابەتەکە دەگۆڕێت.

ئەگەر داواتان لێ بکەم شتێکی سەرسوڕهێنەرم بۆ باس بکەن، ئەوا بابەتەکە لە دەست دەردەچێت. هەر لە پشیلەیەک کە قسە دەکات تا فیلێک کە دەڕوات، یان لقی درەختێکی سێو کە شاڵی قاپشتن دەردەدات، مانگایەک لە بری شیر کۆلا و

هێلکەیەک لە شکڵی شەشپاڵوودا و چەندەها نموونەی تر کە لە ئەقڵ و خەیاڵدا جێگەی نابێتەوە، ڕووبەڕووم دەبێتەوە!

لەم بـــارەدا ئەو پەرتـــووکەی نـــاوم لێنـــاوە بەدیهێـــنراوە سەرســـوڕهێنەرەکان؛ باســـی چۆلەکەکـــان و هەنگەکـــان و پەپوولەکان و ماسییەکان و مێروولەکـان و جەسـتەی مـرۆڤ و خانەکـانی دەکـات. بەدڵنیـاییەوە لە ڕوانـگەی ئێـوەوە هـیچ واتایەک ناگەیەنێت. بە مافی خۆتانی دەزانن و پرسیار دەکەن " بۆچی ئەو زنجیرەیە ناوی سەرسوڕهێنەرە؟"

چونکە هیچ " سەرسوڕمانێک " نابینن.

لە دنیاکەی ئێوەدا هەموو ئەو بابەتانە هیچی "سەرسـوڕهێنەر" نین. بە پێچەوانەوە شتانێکی باو و سروشتی و ئاساییـن.

ئەگەر شێوەی هێلکەیەک شەشپاڵوو نەبێت، ئەوا نە سـەیرە و نە موعجیزەیە!

ئەگەر مانگایەک لە بری شیر کۆلا نەدات، ئەوا لەم نێوەنـدەدا هیچ شتێکی سەرسوڕهێنەر بـوونی نیـیە! ئەگەر لقـی درەختـی سێوێک لە بری سێو شاڵی قاپشتن دەرنەکـات، ئەوا بـۆچی بـۆ درەختێکی سێو سەرسوڕهێنەر بێت!

ئایـا دانـانی نـاوی بەدیهێـنراوە سەرسـوڕهێنەرەکان بـۆ ئەم پەرتووکانە و گەورەکردنیان چ واتایەکی هەیە؟ ئایـا تەنهـا لەبەر

ئەوەی بە شێوەیەکی گاڵتەئامێز دێـتە بەر گـوێمان ئەو ناوەیـان هەڵبژاردووە؟

هەر کاتێـک ڕووبەڕووی ئەو پرسـیارانە بـوومەتەوە، وا بیـرم کردووەتەوە من ڕاست بووم لە هەڵبژاردنـی ئەو نـاوە و ئەوەش بووە بە دەرفەتێکی باش، تـا دیمەنێکـی جیـاواز پیشـانی ئێـوە بدەم. بەڵێ دیمەنێکی جیاواز!

ئەو دیمەنە جیاوازانەی لە کتێبە زانستییەکانی دەربارەی ژیـان و زانستدا! بەدڵنیـاییەوە لە کتێبەکـانی زینـدەوەرزانی و فیزیـا و کیمیا و بیرکاریشدا نییە!

## لە ڕاستیدا هەموو شتێک زۆر سەرسوڕهێنەرە!

ئەگەر لە لقی درەختێکی سێو لە بری سێو شاڵی قاپشتن شۆڕ ببێتەوە، ئەوا دەحەپەسێین ئەی وانییـە؟ ئەم ڕووداوە بە شـتێکی ئێجگار سـەیر و سەرسـوڕهێنەر و بگـرە مـوعجیزەش دەبیـنن. تەنها ئێوە نا، بەڵکو هەمـوو گەڕەکەکە ئەگەر ببیـنن لە لقـی دار سێوێک شاڵی قاپشتن لە بری سێو شۆڕ بووەتەوە، ئەوا هەمـان کاردانەوەیان دەبێت.

ڕەنــگە ئەو کــاتە ئەو خانمـــانەی شـــەو و ڕۆژ خەریکـــی خـاوێنکردنەوەن و ئـالوودەی ئیسـپرتۆ و دەرمـانی پـاکەرەوە و

سپیکردنەوەن، یان دوو کچی بێبەخت لەبەر بێزاری خۆیان دەدەنە بەر کاروباری ماڵ و بۆ دەستکەوتنی شاڵی قاپشتن بۆ مانگەکانی داهاتوو خەو لە خۆیان دەزڕێنن و پێش ئەوەی خەڵک بەخەبەر بێننەوە، هەندێک کیسەی نایلۆنیان پڕ دەکرد لە ئیسفنج.




-شکۆفە شکۆفە! کچێ ڕاکە خودا لەناوت نەبات، خەڵکی هەمووی لای دەرەختەکە کۆ بوونەتەوە! ڕاکە با کۆی بکەینەوە. تۆ سەیری بەرهەمی ئەو دەرەختە موبارەکە! بەرەکەی بۆنی سێوی لێ دێت. دوو دیوی هەیە؛ ئەم لایەی بۆ تاوە سووتاوەکان، ئەمەش بۆ ڕووە ناسکەکان! وششش کە نەرم و نۆڵە!

- دادە شاناز تۆ بەسەر دەرەختەکەدا سەرکەوتووی کچێ؟

- نەخێر، لە ژێرەوەی کۆمکردەوە!

- خێرێکت بکردایە هەندێکیشت بۆ من بهێنایە!

- بەتەمـای حازرخۆریـت؟ هەسـتە بـڕۆ بەسـەر درەخـتەکەدا سەرکەوە، ئەوانەی سەرەوە زیـاتر گەورەن؛ ڕێـک بـۆ مەنـجەڵ دەبن. من نەمتوانی سەر بکەوم، چـونکە نەخۆشـیی دەوالـیم[1] هەیە. دواتر لەویّ دەچەقـم و بە ئـاگرکوژێنەوەش دانـابەزمەوە خوار...




-بۆچی نەیەت دادە شاناز!

-بۆ من پشیلەم، تا ئاگرکوژێنەوە بێت و ڕزگارم بکات؟

دواتر دەڵێن: " چۆن سەرکەوتووە با ئاواش بێتە خوارەوە." تـۆ سەرکەوە!

-ئای خۆزگە دەمتوانی سەرکەومە سەر ئەو دارە دادە شاناز!

---

١- نەخۆشیی دەوالی: بریتییە لە ئەستووربوونی خوێنبەرەکانی قاچ.

- بۆچی کچێ؟

- هیییییی! دادە شاناز کەناڵە تەلەڤزیۆنەکان هاتن! ئـای ئەوە هین نییە؟ پەیامنێرە بەناوبەنگەکە؟....

- تێح...، ئیتر نایەڵن لێی بکەینەوە، ئاخ چـۆن بە قسـە منـت خافڵاند!

- دادە شـاناز پۆلیسـەکە پەت ڕادەکێشـێت، دەوڵەت دەسـتی بەسەر درەختەکەدا گرت!

- هەر دەبێ دەستی بەسەردا بگرن، چۆن وا ئاسـان وازی لـێ دێـنن؟ دەی بـا هـیچ نەبێـت دەوڵەت دایبنێـت! ئەگەر نـا هەر دەوڵەمەندەکان ئەو شاڵی قاپشتنانە کۆ دەکەنەوە. هەژارەکانیش بـا هەر بە تەل قـاپ بشـۆن. نەخێـر قاپەکـان دەڕوشـێنێت، ئەگەریش نەیڕوشێنێت هەر بریندارى دەکات.

- لەبەر ئەوەی تۆ زۆری لێ دەخشێنیت.

- دشـــــەکەم دەفرێکـــــی کریســـــتاڵی داومەتـــــێ، زۆر ڕووشاندویەتی.

- من کریستاڵەکەم هەر لە باوڵەکەمدا هەڵگرتووە.

- بینێـژە بینێـژە! تـۆ لە ژێـر گـڵەکەدا بینێـژە؛ بەشـکم لەوێـدا درەختی کریستاڵ بڕوێت. کچێ کۆی دەکەینەوە.

- دادە شاناز تۆ چیت بەو بیرۆکە سەیروسەمەرانەتەوە!

- کچێ شکۆفە، درەختەکە دەبڕنەوە! ڕاکە با لقێك هەڵبگرین، ڕاکە! لە ئینجانەدا دەیڕوێنین!

- جا دەڕوێت؟

- ئەی ئەگەر ڕووا؟

هەر درەختێکی سێو ئەگەر لە لقەکانی شاڵی قاپشتن بێتە دەرەوە، ئەوا بەدڵنیاییەوە هەواڵێکی گەورەیە!

لە یەک کاتدا ئەو هەواڵە بە هەموو شار و بگرە بە هەموو دنیاشدا بڵاو دەبێتەوە..

هەموو کارەساتەکانی دنیا دەخەنە لایەك، لە هەموو هەواڵە بەپەلەکاندا گوێمان لەوە دەبێت درەختێکی سێو شاڵی قاپشتنمان دەداتێ!

زاناکان لە وردودرشتی ڕووداوەکە دەکۆڵنەوە. هەر وەکو هەموو کاتێک باسی چەند شتانێکی وەک: "بازدانێکی لەناکاو لە پرۆسەی پەرەسەندندا" ، "بازدانێکی گەورە" دەکەن و بابەتەکە ڕوون دەکەنەوە. ئەگەر هەمان ڕوونکردنەوە لەسەر درەختی سێوێکی ئاسایی بکەن، ئەوا زۆر لایان قوورس نابێت.

چەند زانایەکی ئایینیش دەڵێن گوایە قەبری یەکێک لە شێخە ناودارەکانی لەژێردایە، کە بە ناوی دایکییەوە ناسێنراوە. بابەتەکە لە ڕوانگەیەکی ترەوە سەیر دەکەن.

زانا سویدییەکانیش بۆ ئەوەی بزانن ئایا ئەو شاڵی قاپشتنانە زیان بە دەست دەگەیەنێت یاخود نا، ڕۆژەکەیان بە شۆردنی قاپەکان بەسەر دەبەن.

ئەوانەشی بە گوومانەوە سەیری ڕووداوەکە دەکەن دەڵێن: "لەم بابەتەدا شتێکی شاراوە و ئاڵۆز هەیە" و بۆیە سوور دەبن لەسەر ئەوەی پێویستە کەسێک بەدوای بابەتەکەدا بچێت.

ڕووداوەکە لە هەموو ڕوویەکەوە لێکدانەوەی بۆ دەکرێت. بە مانگ قسەی لەسەر دەکرێت، تەنانەت بە ساڵیش و وەکو یەکێک لە ڕووداوە سەرسوڕهێنەرەکان لە مێژوودا تۆمار دەکرێت...

ئەوەی من دەمەوێت پرسیار بکەم دەربارەی ئەوەیە:

" ئەگەر درەختێکی سێو شاڵی قاپشتن دەربکات و ئەوە شتێکی سەرسوڕهێنەر و موعجیزە بێت، ئەی باشە بۆچی ئەگەر سێو دەربکات وانییە؟ "

کاتێک ئەم پرسیارە دەکەم، هەندێک بەم شێوەیە وەڵام دەدەنەوە: " چونکە لە درەختی سێو، سێو بەرهەم دێت."

واتا لەبەر ئەوەی لە درەختی سێو سێو بەرهەم دێت، بۆیە ئەوە شتێکی سەرسوڕهێنەر نییە بۆ ئێمە. بەڵام ئەگەر لە ژیانماندا یەک جار درەختێکی سێومان ببینیبا، ئەوا وەکو بینینی

درەختێکی سێو شاڵی قاپشتن بەرهەم بهێنێت، تووشی سەرسوڕمان دەبووین وایە؟

**ئەو شتەی پێی دەوترێت ڕاهاتن، وەکو پەردەیەک وایە چاومانی داپۆشیووە و سنوورێکی دروست کردووە، لە نێوان ئەو شتانەی دەمانەوێت ببینین و ئەو شتانەشی کە دەیبینین گرنگییەکی نامێنێت بۆمان!**



بۆیە ناوی ئەم زنجیرەیەم ناوە بەدیهێنراوە سەرسوڕهێنەرەکان، چونکە ویستوومە هاوکارتان بم لە بینینی زەوی، ئاسمانەکان، ڕووەکەکان، مێروولەکان، پەپوولەکان، خانەکان و هەموو ئەو شتانەی تر کە لەسەر ئەم گەردوونە بوونی هەیە و لەگەڵیاندا

دەژیـن، وەک ئەوەی یەکەم جـار بێـت بینیبێتتـان. تـا هۆشـیار بنەوە لەوەی هەمـوو شـتێک سەرسـوڕهێنەرە، هەمـوو شـتێک موعجیزەیە...

## ئەمە موعجیزەیەکە! ئەی باشە ئەمە؟

دەڵـێن ئەگەر وشـەیەکت نەزانـی، سـەیری فەرهەنـگ بـکە. ئەگەریش وشەیەکت زانی، دوو جار سەیری فەرهەنگ بکە.

بەو پێیەی وشەی موعجیزە هەمووی واتاکەی دەزانێـت، دوو جار؛ یاخود ڕاستر بڵـێم بـا سـەیری دوو فەرهەنگـی جیـاواز بکەین.

موعجیزە (دەرئاسا) لە "معجـز"ەوە هـاتووە. مـوعجیزەیش بە واتای دەستەوەستانی مـرۆڤ، نەتـوانین، " لە دەسـتی مرۆڤـدا نەبێت" دێت.

لە جەنگـــی بەدردا چەنـــدەها ڕووداوی سەرســـوڕهێنەر و مـوعجیزە ڕوویـان داوە، بـۆ نمـوونە: عەکاشـە شمشـێرەکەی دەشکێت. پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر بێت) دارێکـی دایە دەستی و فەرمانی پێ کرد: "بڕۆ بەوە بجەنگە."

عەکاشــە دارەکەی هەڵگـرت و ئەو دارە بــوو بە شـمشـێرێکی درێژی بـریقەدار. لەو ڕۆژەوە عەکاشـە بەو شمشـێرەوە شـەڕی

کرد، تا لە جەنگی یەمامەدا شەهید کـرا و ئەو شمشـێرەی هـیچ کاتێک لەخۆی دوور نەخستەوە. ئیتر ئەمە موعجیزەیەکە!

جـگە لە پێغەمبەرمـان (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، لە دەستی هیچ کەسێکدا نییە دارێـک بگۆڕێـت بـۆ شمشـێرێکی تیـژی بـریقەدار. لەم بـابەتەدا هەموومـان بە یەکسـانی دەستەوەسـتان دەمێنیـنەوە. بـۆ ئەوەی دارێـک بگۆڕدرێـت بـۆ شمشێرێک یەک مەرج بوونی هەیە؛ ویستی خودا!

چـونکە ئەگەر خـودا ویسـتی لەسـەر بێـت، هەم دار دەبێـتە شمشێر، هەمیش وەکو عەساکەی پێغەمـبەر مووسـا (سـەلامی خوای لەسەر بێت) دەگۆڕدرێت بۆ مار...

هەر وەک چـۆن گـۆڕینی دارێـک بـۆ شمشـێر و مـار مـوعجیزەیەکە، ئەی باشـە گـۆڕینی میـوەش بەو ئەنـدازەیە موعجیزە نییە؟

ئەگەر مرۆڤ دەستەوەستان بێـت بەرانـبەر گـۆڕینی دارێکـی دەستی کە لە لقی درەختێکەوە بەدەست هـاتووە بـۆ شمشـێر و مـار، ئەی باشـە بەو ئەنـدازەیە دەستەوەسـتان نابێـت بەرانـبەر گۆڕینی لقی درەختێک بۆ گێلاس، سێو، هەنار؟

ئەو مرۆڤەی ناتوانێت دارێـک بـۆ شمشـێرێک بگۆڕێـت، لە توانایدا هەیە دوو گێلاسی وەک مرواری تا کۆتایی بهێڵێتەوە؟

- درەختەکان چی بە ئێمە دەڵێن؟

پێغەمبەر مووسا (سەلامی خـوای لـێ بێـت) و خێـزانەکەی، کاتێک لە مەدیەنەوە ڕۆیشتن بۆ میسـر، لەسەر شـاخی "طـور" مانەوە. شەو بوو؛ کەش و هەوا سـارد بـوو. لەسـەر لـووتکەی چیاکە ڕووناکییەکیان بینی لەو تـاریکییەوە دەهـات و دەچـوو. دەکرێت ئەوە ئاگرێک بێت!

"...بە هاوسەر و منـداڵەکانی وت: ئێـوە لێـرە بمێنـنەوە، مـن ئاگرێـک بەدی دەکەم، دەچـم بەڵکـو هەواڵێـک، یـان دار و چیلکەی داگیرسـاوتان بـۆ دەهێـنم بەڵکـو خۆتـانی پـێ گەرم بکەنەوە" (القصص: ٢٩)

بەرەو ڕووی ڕووناکییەکە ڕۆیشت. ئەو ڕێگەیەی دەچـوو بـۆ شاخەکە، بە دۆڵی پیرۆزی طوی (الـوادی المقـدس طـوی) دا دەڕۆیشت.

"جا کە ڕۆیشت و گەیشـتە لای ڕاسـتی دۆڵەکە، لەو بەشـەی کە نووری پیرۆز دایگرتبوو، لە پاڵ درەختەکەدا بانگی لێ کرا: ' ئەی موسا منم (الله)، خـودای پەروەردگـار و خـاوەنی هەمـوو جیهانەکان' " (القصص: ٣٠)

پێغەمـبەر مووسـا بەم شـێوەیە مـژدەی پێغەمبەرایەتـی پـێ بەخشرا.

هەر کاتێک کە درەختێک دەبینم گوڵی گرتووە یاخود میـوەی گرتووە، وا خەیاڵ دەکەم خـودای گەورە لە پشـتی ئەو درەخـتە

هەمەجـۆرانەوە بەنـدەکانی بانـگ دەکـات. هەر وەک چـۆن خودای گەورە سووتاندنی لقی ئەو درەختەی کردە هۆکارێك لە لای ڕاستی دۆڵی طـوی دا، تـا بـانگی پێغەمـبەر موسـای پـێ بکات.

کاتێـک بە نـاو ئەو دار مێـو و باخچـانەی دنیـادا دەگەڕێـم. درەختی گێلاس، درەختی قۆخ، درەختـی بـۆن خۆشـی لیمـۆ، درەختی هەنجیری هەنگوینی، درەختی شیری شاتوو، درەختی خۆشی سێو، لـقە دڕکاوییەکـانی سـەر زەوییـەکە دەبیـنم، هەر هەمان ئایەتم بیر دەکەوێتەوە:

"منم (الله) خودای پەروەردگار و خاوەنی هەموو جیهانەکان."
(القصص: ٣٠)

# تاریق ئۆسلۆ



ناوی ڕاستەقینەی ئۆزکان ئۆزەیە، لە ساڵی ١٩٧٤ لە سەکاریا لەدایکبووە. لە سەرەتای تەمەنی گەنجێتییەوە لە بەشی نووسین- لە گۆڤاری زافەر دەستی بە کارکردن کردووە و لە پاش قۆناغی دواناوەندی پرۆسەی خوێندنی فەرمی تەواو نەکردووە. بۆ ماوەیەک بەڕێوەبەری بەشی نووسینی گۆڤارەکە بوو. چەند ساڵێکیش وردبینی بڵاوکراوەکانی زافەر و خالْخالْۆکە بوو. زۆر کتێبی بە ناوی خۆی و بە ناوی 'تاریق ئۆسلۆ'وە، کە لە کتێبی زانستی منداڵاندا بەکاری دەهێنێت؛ بڵاوکردووەتەوە. زنجیرەی "وەڵامی پرسیارەکانی منداڵی" وەرگێڕدراوە بۆ زمانەکانی ئینگلیزی، ئەڵمانی، فەڕەنسی، هۆڵەندی، ئەندەنووزی و کوردی.

نووسەر، تا ئێستا لە نووسین بەردەوامە و خێزاندارە و دوو منداڵی هەیە.

# پێڕست








- مێرووەکان
- گەردوون
- ئاژەڵەکان
- ڕووەکەکان
- ئاسمان و بەرگەهەوا
- ڕووی زەوی
- جەستەی مرۆڤ
- گەردیلە
- خانە
- باڵندەکان
- ماسییەکان
- ڕەنگ و ڕووناکی
- هەنگەکان
- مێروولەکان
- پەپوولەکان
- خشۆکەکان
- دایك
- درەختەکان
- چاو
- گوێچکە
- مێشك
- لووت

